# سەرهەڵدان و رووخانی یەکێتیی سۆڤیێت

## جۆن ئار. ماتیوز

وەرگێڕانی

ئەبوبەکر ساڵح ئیسماعیل

سەرپەرشتی

زنار تەها






لە: ظهور وسقوط اتحاد شوروی

جان ار. ماتیوز انتشارات ققنوس

چاپ سوم ١٣٨٤ وەرگێڕدراوە



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **سەرهەڵدان و رووخانی یەکێتی سۆڤێت**
- نووسینی: جۆن ئار. ماتیوز
- وەرگێڕ لە فارسییەوە بۆ کوردی: ئەبوبەکر ساڵح **ئیسماعیل**
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: مراد بەهرامیان
- ژمارەی سپاردن: ٢٦٨٦
- نرخ: ٢٥٠٠ دینار
- چاپ: یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٣٨٠)





مالّپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com






## پێرست

## ڕووداوە گرنگەکانی مێژووی یەکێتی سۆڤێت

| ١٩٠٥ | ١٩٢١ | ١٩٢٢ | ١٩٣٤ | ١٩٤٥ |
|---|---|---|---|---|
| ٢٢ی ژانویە، ((یەکشەمەی خوێناوی)) نیشانەی سەرەتای شۆڕشی ١٩٠٥ کە پێشەکییەك بوو بۆ شۆڕشی ساڵی ١٩١٧. | گرانیی ناوچەی ڤۆلگا داوەگرێ. | لە مانگی دیسامبر یەکێتیی کۆمارەکانی سۆسیالیستی سۆڤێتی بە ڕەسمی دادەمەزرێ. | لە مانگی دیسامبر سرگی کیروف لە لینینگراد دەکوژرێ. | لە مانگی فوریە ستالین لە یالتا لەگەڵ ونستۆن چرچیل و فرانکلین روزفلت دیدار سازدەکات هەتا ستراتیژی پاش جەنگ دابرێژن. |

| ١٩٠٠ ١٩١٠ | ١٩٢٠ | ١٩٣٠ ١٩٤٠ | ١٩٥٠ |
|---|---|---|---|
| ١٩١٧ | ١٩١٨ | ١٩٢٩ | ١٩٤١ |
| بە پێی ساڵنامەی کۆن لە فوریەی ١٩١٧ و بە پێی ساڵنامەی نوێ لە مارتی هەمان ساڵ، ژنانی پەتروگراد بە هۆی کەمبوونی نان، شۆڕش دەکەن، کرێکاران دەست بە مانگرتن دەکەن و دەوڵەتی کاتی دادەمەزرێ و نیکۆلای دووەم دەست لە کار دەکێشێتەوە. | لە مانگی مارت پەیمانامەی برست لیتوفسك Brest Litovsk مۆر دەکرێ و لە ئەنجام دا، ڕوسیا لە بەشداری کردن لە جەنگی یەکەمی جیهانی پەناگیردەبێ، لە مانگی نیسان جەنگی ناوخۆیی دەست پێدەکا، نیکۆلای و خێزانەکەی و خزمەتکارەکانی هەموو دەکوژرێن | ستالین کڵێساکان دادەخاو ڕاسپێردە مەزهەبییەکان قەدەغە دەکا مولکدارێتی سۆسیالیستی زۆرەملێ دەست پێدەکا.<br>١٩٢٤ لە مانگی ژانویە لینین دەمرێ و ستالین دەسەلات دەگرێتە دەست. | لە مانگی ژوئن ئەڵمانیا سنووری یەکێتی سۆڤێت دەبەزێنێ، سۆڤێت بە لایەنگری هاوپەیمانان دەچێتە نێو جەنگەوە. |



| ١٩٥٣ | ١٩٦٤ | ١٩٧٢ | ١٩٨٦ |
|---|---|---|---|
| لە یەکی مارت ستالین دەمرێ، نیکیتا خرۆشیف وەك سکرتێری یەکەمی حیزب کە (پێشتر بە سکرتێری گشتی دەناسرا) هەڵدەبژێردرێ. | لە ١٥ی ئۆکتۆبەر خرۆشیف لەسەر کار لادەبرێ لیونید برژنیف دەبێتە سکرتێری یەکەم. | دانووستاندنەکانی تایبەت بە سنووردارکردنی چەکە ستراتیژییەکان (سالت) پەیمانامەی کەمکردنەوەی چەکەکانی لە مانگی مایو لێدەکەوێتەوە. | لە مانگی ئۆکتۆبەر دیداری سەران بە ئامادەبوونی گورباچیف و ڕۆناڵد ریگان لە شاری ریکیافیك لە ئایسلاند بەڕێوەدەچێ.<br>١٩٩٠<br>بۆریس یەڵتسین لە مانگی مایو وەکو سەرۆك کۆماری ڕوسیا هەڵدەبژێردرێ. |

| ١٩٥٠ ١٩٦٠ | ١٩٧٠ | ١٩٨٠ | ١٩٩٠ ٢٠٠٠ |
|---|---|---|---|
| ١٩٥٦ | ١٩٦٨ | ١٩٧٩ | ١٩٩١ |
| خرۆشیف ((ئاخاوتنی نهێنی)) خۆی دەست پێدەکات و لە مانگی فوریە ستالین سڕینەوە دەست پێدەکا<br>١٩٥٧<br>سۆڤێت لە ٤ی ئۆکتۆبەردا یەکەم مانگی دەستکردی خۆی بە ناوی سپۆتنیك یەك، بۆ ئاسمان دەنێرێ. | لە مانگی ئوت، سۆڤێت، دەچێتە ناو خاکی چیکۆسلۆڤاکیا. | لە مانگی ژوئن پەیمانامەی (سالت دوو) واژۆ دەکرێ، بەلام ئەمریکا پشتیوانی لێ ناکا. | لە مانگی ژوئیە گورباچیف و جورج بوش پەیمانی کەمکردنەوەی چەکە ستراتیژییەکان (ستارت) واژۆ دەکەن. لە مانگی ئوت لە میانی کودەتایەکی ناکام<br>گورباچیف لە هەواری کوێستانی دەست بەسەردەکرێ، لە مانگی دیسامبر گورباچیف لە پلەی سەرۆك کۆماری دەست لە کار دەکێشێتەوە یەکێتی سۆڤێتی بە ڕەسمی پاشەکشێ دەکا. |





## پێشگوتار:

### لە سەروبەندی شۆڕشدا

کاتێك ساڵی ١٩١٧ شۆڕشی روسیا دەستیپێکرد، هیچ کەسێك- تەنانەت بە جۆشترین لایەنگرانی شۆڕشیش- نەیدەتوانی پێشبینی سەرەنجامی کار بکا. بەر لەوەی ئەو ساڵە چارەنووس سازە کۆتایی بێ، تزار نیکۆلای دووەم، کە بە فەرمانڕەوای میراتیی روسیا دەژمێردرا، دەستبەسەرکرا. ساڵی دوایی لە میانی جەنگی ناوخۆییدا کە نیشاندەری ئەوە بوو ئایا حکومەتی تازەدامەزراوی سۆسیالیستی درێژە بە مانەوەی خۆی دەدا یان نا، نیکۆلاو ئەندامانی خێزانەکەی، تزارینا ((ژنی تزار)) ئەلیکساندر، کوڕەکەی و چوار کچەکەی و هەروەها هەمووخزمەتکارەکانیشیان- بە شێوەیەکی بێبەزەییانە کوژران. حکوومەتی نوێ کە رابەرانی، خۆیان بە کۆمۆنیست ناودەبرد، بە درێژایی سەردەمێکی درێژ-٧٤ ساڵ- زنجیرەیەك کارەساتیان وەبەرهێنا کە ئێستاش وڵاتی روسیا نەیتوانیوە خۆی لە شوێنەوارەکانی پاك بکاتەوە.



**تزار نیکۆلای دووەم لەگەڵ سێ لە کچەکانی لە کاتی دەستبەسەری دا پاش لادانی لە پاشایەتی**

### زەوینەی بەرایی شۆڕش

لە سەدەی نۆزدەیەمدا تۆوی شۆڕشی روسیا چەکەرەی کرد و ئەو سەردەمەش ڕۆژگاری شۆڕشەکانی جوتیاران بوو کە رادیکاڵە شۆڕشگێرەکان ئەوانیان هان دەدا. حکومەتی ئیمپراتۆری لە وەڵامی ئەو نائارامییانەدا، کۆمەڵە هەوڵێکی لەسەرە ڕێگای هێنانەدی



چاکسازیگەلێك خستەکار. بەڵام ئەو هەوڵانە زیاتر سیمایان بەسەر رووپەڕی کاغەزانەوە بوو تا مەیدانی کارکردن. بۆ نموونە سیستەمی رەعیەتدارێتی زەوی[1]، کە پاشماوەی فیودالیزم بوو و لە راستیدا بە کردەوە ملیۆنان کەسی دەکرد بە کۆیلە، لە ساڵی ١٨٦١دا هەڵوەشایەوە. بەڵام وێڕای ئەو ئازادییەش کە ئەوان دەستیان کەوت، خەرجیگەلێکی لە توانا بەدەر بەسەر ملی ئەو رەعیەتانەدا سەپێنرا. ئێستا ئەوان وادارکرابوون کە ئەو زەوی و زارەی پێشتر کاریان لەسەر دەکرد، بکڕن و حکوومەت فەرمانی بە وان دەدا نرخی زەوییەکان لە ماوەی ٤٩ ساڵدا بە خاوەنەکانی پێشووی خۆیان بدەن.

*پێشڕەوانی شۆڕش*

*یاخیبوونەکانی کرێکارانی کارگەکان و جوتیاران لە پەنای ئەو نائارامییە کۆمەڵایەتییەکە بە کاریگەری سەنعەتی بوونی وڵات و ریفۆرمی کشتوکاڵ پاش ئازادی رەعیەتەکان لە ساڵی ١٨٦١دا هاتبووە ئاراوە، هەموویان بە هۆکاری گرنگی سەرهەڵدانی شۆڕش دەژمێردران. هێلین کاریردانکوس، پسپۆڕی زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی پاریس، لە کتێبەکەیدا بە ناوی لینین: شۆڕش و دەسەڵات، هەلومەرجی جوتیاران لە ساڵانی پێش شۆڕشدا بەم جۆرە وەسف دەکا:*

*کێشەی گەورەی ئیمپراتۆریای روسیا لە کۆتایی سەدەدا، زەوی بوو. لە سەدا هەشتای دانیشتوانی وڵات لە جوتیاران پێکهاتبوو {سەرجەمی دانیشتوان لە ١٩١٣دا نزیکەی ١٥٩ ملیۆن کەس بوو} و ئەو زەوییەی لە سەری دەژیان بەرهەمێکی تەواوی نەدەدا کە خۆراکی ئەوان دابین بکا. لە ١٨٦١ یاسای ریفۆرمی زەوی، رژێمی رەعیەتدارێتی هەڵوەشاندەوە و ئەو مافەی بەجوتیاران بەخشی کە زەوی بۆ خۆیان بکڕن. زۆرێك لەوان بە هۆکاری دەستکورتی، نەیانتوانی کەڵك لەوە وەربگرن، و چاوپۆشیان کرد. لە حاڵێکدا جوتیارانی تر باری گران و هەمیشەیی ئەم قەرزەیان خستە سەر شانی خۆیان.*

*گوندەکانی وڵات پڕ بوون لە جوتیاری بێ زەوی. ئەوانەی پارچە زەوی بچووکیان هەبوو، تا رادەیەك خۆش گوزەران بوون و پاشان بوونە موڵکداری گەورە.*

*ریفۆرمەکانی زەوی ئەوانی وادارەدەکرد کە کشتوکاڵی سۆسیالیست و کۆمۆنیان هەبێ. {لە راستیدا بەربەستی بۆ هەڵوەشانەوەی رژێمی رەعیەتدارێتی پێکدەهێنا} ... پیادەکردنی ئەم پرەنسیپە بە هۆکاری ئەوە بوو کە حکوومەتی سەرکوتکەر وای وێنا دەکرد، ئەو کارە دەبێتە هۆکار بۆ پتەوبوونو جێگیربوونی هەلومەرجی گوندەکان، {ئەم رەهەندە سۆسیالیستییە} بووە هۆکاری ئیفلیجبوونی جوولانەوەی چالاکترین جوتیاران ، و لە ئەنجامدا، گەشەکردنی کشتوکاڵی راگرت.*

---

[1] - رەعیەتانی زەوی یان موڵك: ئەوانە جووتیارانی لادێ نشینەکان بوون لە سەردەمی فیودالیزم دا وەك پاژێك لەو زەوی و موڵکانە دەکڕدران و دەفرۆشران. (وەرگێڕ)



**نائارامی و شۆڕشی جووتیاران دوو شۆڕشی**
**به دواخۆیدا هێنا، شۆڕشی دووەمیان توانی رژێمی پاشایەتی بڕوخێنێ**

جون برگامینی، بیۆگرافی نووسی دوومان رومانوف، مانای بنەماڵەی نیکۆلای، دەنووسێ:

((کۆمەڵێك لە رەعیەتانی پێشوو بە بیستنی ئەو مەرجە کە دەبێ باری گرانی قەرزدانەوەی ٤٩ساڵە بە شانی خۆیاندا بدەن، بە دەنگێکی بەرز لە قاقای پێکەنینیاندا))[١] یاخیبوونەکانی قۆناغی جووتیاران پاش ئازادی رەعیەتەکان، وێڕا بە جووڵانەوەی پەرەگرتووی دەستبژاردەی خوێندەواران کە هەوڵیان دەدا بە شێوەیەك لە حکوومەتی نیشتمانیدا رۆڵیان هەبێ، کەش و هەوایەکی پڕ لە خرۆشان و نائارامی هێنایەکایەوە کە لە سەرەتای سەدەی داهاتوودا دوو شۆڕشی بەدوا خۆیدا هێنا. شۆڕشی دووەم بە سەرکەوتوویی توانی تاج و تەختی پاشایەتی بپێچێتەوە.

وێڕای نائارامی جووتیاران و پەیوەستبوونی دەستبژاردەکان و رووناکبیران بە رادیکاڵەکانەوە، دیاردەیەکی یەکجار گرنگی دیکە لە حاڵی گەڵاڵەبووندا بوو: شۆڕشی پیشەسازی بە درەنگەوە گەیشتبووە روسیا. بەڵام سەرەڕای بوونی پڕۆژە گەلی زەبەلاحی وەکو راکێشانی هێڵی ئاسنی سەرتاسەری لە سیبریا، ئەو وڵاتە پان و بەرینە پاشکەوتووە نەیدەتوانی لە زەرفی ماوەیەکی کورتدا بچێتە پاڵ گروپی وڵاتانی پیشەسازییەوە، لە ئەنجامدا، هاتنە



ناوەوەی پیشەسازی، شوێنەوارێکی راستەوخۆی کەمی لەسەر ئاپۆڕای بەرینی خەڵك دانابوو. بە هەموو ئەو وەزعانەوە، ژمارەیەکی کەم، بەڵام روو بە پەرەستاندنی کرێکارانی پیشەسازی، دەستبژاردانی رادیکاڵی بۆ تێکۆشان رادەکێشا. بە پێی نووسینی جویل کارمایکل، مێژوونووس، ((ڕادیکاڵەکان، سەرنجی خۆیان لەسەر چینی کرێکاری پیشەسازی، وەك ناونیشانی تەنیا رێگایەك بۆ گۆڕانکاری کۆمەڵگا چڕدەکردەوە))[٢].

هاتنی روسیا بۆ نێو مەیدانی شۆڕشی پیشەسازی، لە ئەنجامی داهێنانی خاوەنکاران و سەرمایەدارانی ناوخۆ نەبوو، بەڵکو دەوڵەتی سەرکار، ژمارەیەك کۆمپانیای لە وڵاتانی دەرەوە بانگهێشت کرد تا بە کۆمەکی ئەوان جۆرێك ئیمپراتۆری پیشەسازی بنیات بنێ کە بوودجەکەی، بەلای کەمەوە تا ئاستێك، بۆ ئاسانکاری لە مەڕ باجگیریی لە بەرهەمە کشتوکاڵییەکان،دابین بکا. بەو پێیە دەست کرا بەدامەزراندنی کارگە و کارخانەگەلێکی گەورەی پیشەسازی، بەو هیوایەی کە بە یەکجار روسیا بخەنە نێو دنیای نوێ وە.

ئەم شاڵاوبردنە بە پەلە بەرەو پیشەسازی کردن، گۆڕانکاری گەلێکی لە نێو کۆمەڵگادا هێنایە ئاراوە کە بە قازانجی بیروباوەڕەکانی دەستبژاردە رادیکاڵەکان لە سەرە رێگای گەیشتن بە شۆڕش بوو. ئەم گروپە شۆڕشگێڕانە، لەلایەن رووناکبیرانی لە خوێندن دەرچوو و ئەو دەستەیە لە ئەندامانی چینە بژاردەکانی کۆمەڵگا کە شەیدای بیری سۆسیالیستی باوی سەراسەری ئەوروپا بوون، رێبەری دەکران. بەربڵاوترینی ئەو بیروباوەڕانە لە بواری سۆسیالیزمدا، کارل مارکس، فەیلەسووفی ئەڵمانی سەدەی نۆزدەیەم (١٨٨٣- ١٨١٨) گەڵاڵەی کردبوو.

## سۆسیالیزم: تاقیکردنەوەیەکی رادیکاڵی

کارل مارکس لەو باوەڕەدابوو کە فراژووبوونی کۆمەڵگا شارستانییەکان بە پلەی یەکەم بە کاریگەری هۆکارە ئابوورییەکان شێوە وەردەگرێ. ئەو وای بیردەکردەوە کە ئەو فراژوو بوونە بە قۆناغ گەلێکدا تێدەپەڕێ کە دەرەتانی خۆ لێ بواردنی نییە؛ پێش ئەوەی سۆسیالیزم بەرقەرار ببێ، دەبێ قۆناغی سەرمایەداری وەدەربکەوێ. پێناسەیەکی کە ئەو لە بارەی رژێمی سەرمایەدارییەوە بە دەستییەوە دەدا ئاوابوو: ئامرازەکانی بەرهەمهێنان ((کارگەکان، هێڵەکانی رێگای ئاسن، بازاڕی فرۆشتن و شتی تر)) بە دەست ژمارەیەك ((سەرمایەدار))ەوەیە سوود لە دەست رەنجی کرێکاران وەردەگرن. بەو پێیە سەرەنجام مشتێك سەرمایەداری

دەوڵەمەند، دەبن بە خاوەنی هەموو سەرمایەی وڵات، و لە بەرامبەر کرێیەکی کەمتر،داوای کاری هەرچی زۆرتر لە کرێکاران دەکەن. ئەم رەهەندە نائارامی و شۆڕشێکی بەربەرین لە نێو کرێکاران دەڕەخسێنێ، کە رژێمی سەرمایەداری و هەروەها ئەو حکوومەتەش کە پشتیوانی لەو رژێمە دەکا، ژێرەو ژوور دەکا. قۆناغی کۆتایی، هاتنەکایەی رژێمی کۆمۆنیستییە کە لەوێدا خودی کرێکاران لە رێگای هاوبەشی کردنی هەوڵ و تواناکان لە نێو دەروونی کۆمەڵگای سۆسیالیستیدا، حکوومەت دەگرنە دەست و بەو پێیە ئیدی دەوڵەتێك لە کاردا بوونی نابێ.



کارل مارکس لەو باوەڕەدا بوو کە رژێمی سۆسیالیستی لە روسیا بەرپا دەبێ

فەلسەفەی مارکس لە ماوەی ساڵانی داهاتووی سەدەی نۆزدەیەمدا لە سەرتاسەری ئەوروپا بە تایبەتی لە روسیادا، ئەو جێیەی کە بە هۆکاری هەژاری، نائارامی لە نێو خەڵکدا زیاتر دەبوو و سەرکوتکارییەکانی حکوومەتیش پتر توندیی بە خۆوەدەگرت، بووە جێگای باس و توێژینەوە. ئەو نائارامییانە لە ساڵی ١٩٠٥دا بۆ شۆڕش گۆڕا.

## شۆڕشی ١٩٠٥

لە ساڵی ١٩٠٥دا شۆڕشێك روویدا کە لە راستیدا راهێنانی کۆتایی شۆڕشی ١٩١٧ بوو. مەبەست ئەوەیە کە شۆڕشی ١٩٠٥ سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا. لە ژینگەیەکدا کە نائارامی روو لە هەڵچوون و پەرەستاندن بوو، تزار دەستی بە کۆمەڵە پێشکارییەك بۆ سەرکوتکردن کرد. لەوانە بەرتەسککردنی سنووری هەڵسوورانی چاپەمەنی و کۆبوونەوەی جەماوەری، کە ئەمە بۆ خۆی هێزی بە رادیکاڵەکان بەخشی.

لە بەرواری ٢٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٠٥، رۆژێك کە زووبەزوو بە ناوی یەکشەمەی خوێناوی ناوبانگی دەرکرد، سەربازان بەرەو رووی خەڵکی بێ پەنا کە لە سان پەتروسبوورگ، پایتەخی روسیا بە شێوەیەکی ئاشتیانە دەستیان بە خۆپیشاندان کردبوو، و خوازیاری چاکسازیی بوون، بوونەوەو گوللە بارانیان کردن. ئەم یەکشەمەی خوێناوییە بووە هۆکاری خۆپیشاندان و یاخیبوونی زیاتر. تزار نیکۆلای، کە نیگەران و هەراسان ببوو، بە ناچاری ملیدایە بەر بەڕێوەبردنی کۆمەڵە چاکسازییەکی بەرتەسك. ئەو، دەستی کرد بە پێکهێنانی ئەنجوومەنێکی هەڵبژاردن بە ناوی ((دوما))وە، کە وەکو ئەنجوومەنێك بێ لە گەڵاڵەکردنی یاساکان و لەدەسەڵاتی دەوڵەتدا بەشدار بێ. ئەم جوولانەوەیە بووە بایسی لاوازبوونی ئومێدی رادیکاڵەکان. ئەو رادیکالانەی کە خوازیاری چاکسازی نەبوون، بەڵکو دەیانویست هەر لە بنەڕەتەوە رژێمی حکوومەتی تزاری نەهێڵن و لە جێگای ئەودا، حکوومەتی سۆسیالیستی بەرقەرار بکەن. بۆ بێ بەختی، نیکۆلای نە بەشداریکردنی ئەنجوومەنی ((دوما))ی لە دەسەڵاتی خۆیدا قبووڵ دەکرد و نەدانانی یاساکانیش، بەو پێیە، یەکەمین دانیشتنی دومای لە ساڵی ١٩٠٦، وە دووەمین دانیشتن لە ساڵی ١٩٠٧و سێیەمین دانیشتنیش لە ١٩١٢دا هەڵوەشاندەوە، تزار کە بەو پێیە لە نێو بنبەستێکی سیاسیدا گیری خواردبوو، حکوومەتی سەرەڕۆی خۆی دەستپێکرد. دوژمنایەتی ئاپۆڕای خەڵکی، کە هەم لە ئەنجوومەنی دوما و هەم لە چالاکی گروپە ریفۆرمخوازەکاندا خۆی دەنواند، بە درێژایی یاخیبوونی ساڵی ١٩٠٥ تا سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانی لە ساڵی ١٩١٤، هاتە جۆش و رۆژ بە رۆژ پتر روو بە پەرەستاندن بوو.

## جەنگی یەکەمی جیهانی

لە ساڵی ١٩١٤ روسیا بە لایەنگریی لە فەڕەنسا و بریتانیا و لە دژایەتی بۆ دەستدرێژی ئەڵمانیا و نەمسا و هەنگاریا بۆ سەر ناوچەی باڵکان، لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا بەشداری کرد. لە سەرەتادا وا دەهاتە بەرچاو کە خەڵکی روسیا،داژداری لە بەشداربوونی وڵاتەکەیان لە جەنگدا دەکەن. بەڵام پاشان ئەو جۆش و خرۆشەی کە لە ئاکامی سەرکەوتنەکانی بەراییدا هاتبوونە دی، هێور بۆوە و نەما. بەو جۆرە کەدانیل دیلر لە بەرهەمە تازیار و پوختەکەی خۆیدا لە بارەی مێژووی یەکێتیی سۆڤیێت دایناوە، ((زنجیرەیەك تێکشکانی گورچکبڕ کە لە شەڕگەی ئەڵمانیا بەر روسەکان کەوت، ورەی ئەوانی تێکشکاند و لە ئەنجامدا بووە هۆکاری زەرەرو زیانێکی یەکجار قورس بۆ روسەکان))[٣].

سەربازگیریی سوپای روسیا زیاتر لەنێو چینی جووتیاراندا بەرێوە دەچوو. لە ئەنجامدا، ژمارەی کرێکارانی کشتوکاڵی کەم بۆوە و ئەم کەمبوونەوەیە لەو سیستەمە کشتوکاڵییە کۆن و پاشکەوتووەدا، بووە هۆکاری کەمبوونی خواردەمەنی. ئەو کەمبوونە زیاتر ئازاری بەدانیشتوانی شارەکان دەگەیاند. چونکە بۆ خۆراك پێدانی سوپاییەکان لە شەڕگەدا، سوود لە بەرهەمی کشتوکاڵی وەردەگیرا. لە شوباتی ساڵی ١٩١٧ لە پایتەخت کە ئیدی بە پەتروگراد ناودەبرا، شۆڕشەکانی نان سەریان هەڵدا. کە ئەویش بووە هۆکاری سەرهەڵدانی یاخیبوون و خۆپیشاندان لە دژی جەنگ.

لە روانینی نیکۆلایدا، درێژەپێدانی جەنگ بۆ مانەوەی روسیا رۆڵێکی بنەڕەتی هەبوو و ئەو کاتێکی زۆری بۆ بەسەرکردنەوەی سوپاییەکان لە شەڕگەی جەنگدا بەسەردەبرد. وەزیرەکانی، کە لە پایتەخت مابوونەوە، لە ئامادەنەبوونی ئەو، گوێیان بەو پەیام و بانگەوازە بە پەلە و زۆر پێویستانە نەدەدا کە لە بازاڕو کۆڵانەکانەوە بەر گوێ دەکەوتن و لە جیاتی ئەوە سەرگەرمی پرسگەلی بەندو بەست و کەڵەکبازییەکانی دەربار بوون. لە ئەنجامی ئەو رەهەندانەدا، هیچ کەسێك لە نێو دەزگای حکوومەتدا ئامادە نەبوو بۆ چارەسەرکردنی ئەو شێواوی و پشێویانەی کە لە ئاکامی کەمبوونی خواردەمەنیدا پەیدا بووبوون، دەستبەکاربێ. نائارامییەکان، بە تایبەتی شۆڕشەکانی نان، هەروەکو نیشانەیەك بۆ بانگەوازی هێزە شۆڕشگێڕەکان بەکاردەبرا، ئەو هێزانە پاش تێکشکانی شۆڕشی ١٩٠٥، بە شێوازی نهێنی، خۆیان بۆ کەڵك وەرگرتن لە هەلومەرجێکی لەم بابەتە ئامادە دەکرد.

## (١)

## شۆڕشی ١٩١٧

یەکەمین زەربەکانی شۆڕشی ١٩١٧ لە مانگی شوباتدا لە شاری پەتروگراددا هەستی پێکـرا. ئەمە لە سێیەمینساڵی جەنگی یەکەمی جیهانیدا بوو. خواردەمەنی ئەوەندە دەگمەن بووبوو، کە تەنانەت پیاوانی ملکەچی قانوون لە کۆڵان و شەقامەکاندا دەستیاندایە شۆڕش. ئەم شۆڕشانە بـۆ خۆیان بوونە هۆکاری نارەزاییگەلی دیکە، لەوانەش خۆپیشاندانی خەڵك و مـانگرتنی کرێکـارانی کارگەکان کە بە هۆکاری گوشارەکانی جەنگ ئیدی جوولە لە لەشیاندا نەمابوو.

## شۆڕشەکانی نان

نیکۆلای و وەزیرەکانی بە تێکڕایی، شۆڕشەکانی نان و مانگرتنەکانی دیکەیان، کـە دەکـرا چارەسەر بکرێن، هەروەکو مانگرتنەکانی تری رابردوو، بە کەم بایەخ دانـا. ئـەوان بـە هەڵـەدا چوو بوون. بە پێچەوانەی چاوەڕوانی ئەوان، شۆڕشەکان خامۆش نەبوون. بەڵکو رۆژ بە رۆژ تـین و تاویان پتر دەبوو. جاناتانساندرز، یەکێك لە مێژوونووسانی شۆڕش، حاڵ و باری خـەڵك لـەو قۆناغەدا بەم شێوەیە وەسف دەکا: ((ئەوان لە ئاکامی بێدادی وەگیان هاتبوون، لە سەرزەنـشت و نارەزایەتی باکیان نەبوو. ئەوان لافیتە گەلێکیان بە دەستەوە بوو کە لێی نووسرا بوو: مـردن بۆ پاشایەتی))[٤]

سوپاییان کە بەرفەرمانی سەرکوتکردنی شۆڕشگێڕان بوون لە بەرامبەر تزاردا وەفاداربوون؟ کاتێك بەشێك لەو یەکە نیزامییانە بە فەرمانی فەرماندەکانیان ئاگری چـەکەکانیان ئاراسـتەی خەڵك کرد. بەڵام زۆرێك لە سەربازان کە بێزیان لەوە دەبۆوە ئاگر بارانی خەڵکی خۆیـان بکـەن بە سادەیی فەرمانەکەیان بە ناچیز وەرگرت، پاژێکی تریان کە لە فەرمانێکی ئاوا سەرپێچییان کردبوو، بە گروپی خۆپیشاندەرانەوە پەیوەست بوون.





**لە کاتی شۆڕشەکانی ناندا، دووکەس لە سەربازان کە لە فەرمانی فەرماندەکانیان بۆ بەکارهێنانی چەك دژی خەڵك سەرپێچیان کرد، بە گروپی خۆپیشاندەرانەوە پەیوەست بوون**

مێژوونووسێك بە ناوی ویلیام هنری چمبرلین لە بارەی ئـەوەی کـە قۆزاقـەکان، سـەربازانی سوارەی هەڵبژاردەی باشووری روسیا، لە پرسی هێرشکردن بۆ سەر خەڵك، چۆن بەسەر دوودڵـی و راڕایی خۆیاندا زاڵبوون، بەو شێوەیە دەنووسێ ((پەلێك قۆزاقی سوارە بە نێـو هۆیهاکێـشانی بەرز و هاواری خۆشیی خەڵکدا کە لە ناوچەی نڤسکی شۆڕشیان دەسـتپێکردبوو، لـە شـەڕەکە دوورکەوتنەوە و بێ ئەوەی کەمترین ئازاریان پێ بگەیەنن شۆڕشـگێڕانیان بـە حـاڵی خۆیانـەوە بەجێ هێشت.))[٥] یەکەمین سەرپێچی پیاوانی نیزامی لەو مەیدانەدا بـووە هۆکـاری هانـدانی خۆپیشاندەران و گۆڕەپانی شۆڕشەکانیشی پتر فـراوان کـرد. لـە میـانی ئـەو حـاڵ و بارانـەدا، مانگرتنی گشتی بووە مایەی ئەوەی کە نائارامییەکانی خەڵك بە قۆناغەکانی قـەیران بگـات. کەش و هەوایەکی ئاوا زۆر بە توندی بۆ کڵپەستاندن لە بار بوو، بۆ زۆرانێك لە رادیکاڵەکان کە ((هەڵسووڕانی نهێنییان هەبوو)) لە کاتی زەمینەیەکی وا گونجاوی رەخساندبوو شیانی خۆ لـێ بوواردنی نەبوو، کە پاش شۆڕشی بە ئاکام نەگەیـشتووی ١٩٠٥ ئـیتر لـە قەدەغەکارییـەکانی پۆلیسی نهێنی تزار سڵ نەکەنەوە.

## سەرهەڵدانی نهێنیی راپەڕینی شۆڕشگێڕانە

شۆڕشگێڕانی ١٩٠٥ نە هەڵاتبوون و نە تێکشکانیشیان قبووڵ کردبوو. بەڵکو کاتی خۆیان لە (دووره هەوار) لە چاوەڕێی هەلومەرجێکی گونجاودا بەسەردەبرد، کە لەداهاتوودا بێتە پێشەوە تا جارێکی تر دەست بە راپەڕین بکەنەوە. ئێستا ئەو هەلومەرجە فەراهەم ببوو. بەرهەڵستییەکان هاوشان و یەکئاهەنگ نەبوون. بەڵام رابەرانی رادیکاڵ ئارەزوویان ئەوەبوو، کە بە کەڵك وەرگرتن لە شەپۆلی شۆڕشی خەڵك، حکوومەت ژێرەوژوور بکەن. ئەوان لە پاشاندا دەیانتوانی رەوتی سەرکردایەتی باشتر رێکوپێك بکەن. ئەو شۆڕشگێڕانە زیاتر رادیکاڵ بوون پێشنیاریان بۆ نیکۆڵای کرد کە کۆتایی بە جەنگ بێنێ. تەنانەت ژەنراڵەکانی تزار وردە وردە متمانەی خۆیان لە دەست دەدا.

نیکۆڵای بەپێی روانینی ژەنراڵەکان، کە گوتبوویان درێژەکێشانی حکوومەتەکەی لە توانادا نییە، سەلماند و لە بەرواری ٢ی مارتی ١٩١٧ رایگەیاند کە ئامادەیە دەستبەرداری پاشایەتی ببێت.

هەموو مێژوونووسان پێیان وایە کە تزار پیاوێکی بوودەڵە بوو. ئەو بێ هیچ گومانێك پەیوەندییەکی لەگەڵ خەڵکی خۆیدا نەبوو، لە لایەکی تریشەوە ئەو بەدابەشکردنی دەسەڵاتی خۆی لەگەڵ ئەنجوومەنی دومادا ناڵێك بوو، بەڵام سەرەنجام بەو کارانە، ئەو لەگەڵ وڵاتەکەی خۆیدا رووبەڕوو بۆوە. ریچارد پایپسی مێژوونووس، لە کتێبی شۆڕشی روسیا، ئاوا نووسیویە: ((ئەگەر ئامانجی بنەڕەتی نیکۆڵای پاراستنی تاج و تەختی خۆی بووبێ، ئەوا پێویست وابوو بەزوویی لەگەڵ ئەڵمانیادا ئاشتی بکا و بۆ سەرکوتکردنی شۆڕش لە پەترۆگراد و مۆسکۆ کەڵك لەو هێزانەی سوپا وەربگرێ کە لە بەرەی شەڕدا بوون. بەڵام لە جیاتی ئەم کارە، تاج و تەختی خۆی لە دەستدا بۆ ئەوەی بەرەی جەنگ بپارێزێ.))[٦] بە لە نێو چوونی رژێمی پاشایەتی، پێویست وابوو، هەرچی زووتر حکوومەتێکی نوێ بەرپرسیارێتییەکان بگرێتە ئەستۆ. کۆتایی رژێمی پاشایەتی، بەتاڵایی لە سەرکردایەتیدا پێك هێنا. لە ئەنجامدا، یاریزانانی بنەڕەتی گروپە جۆربەجۆرەکان بۆ پڕکردنەوەی ئەو بە تاڵاییە بە پەلە بەخۆکەوتن. نە هەر تەنیا شۆڕشگێڕانی رادیکاڵ، بەڵکو تەنانەت حیزبی لایەنگری لیبراڵی دیموکراسی، کە بە بەشدارانی ئەوانیان دەگوت کادیتەکان، و هەروەها پاشماوەکانی پاشایەتیخوازانیش بە هەڵەداوان هاتنە نێو مەیدانەکەوە.



## دەوڵەتی کاتی

لە میانی شۆڕشەکانی رابردووی روسیا، ئەنجوومەنی ناوچەیی پێکهاتبوون تا بەسەر بەڕێوەبردنی کاروبار بە شێوەیەکی ناوچەیی رابگەن و نوێنەرانی سەرەتایی کرێکاران و جووتیاران بن. رابەرانی شۆڕشەکان و مانگرتنەکان کە شۆڕشیان هێنایە ئاراوە لەو ئەنجوومەنانەوە، سەریان هەڵدا.

بەشێك لە ئەندامانی ئەنجوومەنی دوما، کە تزار بەر لە دەست لە کارکێشانەوەی خۆی، هەڵیوەشاندبۆوە لە دەوری یەکتری کۆبوونەوە و کۆمیتەیەکی راپەڕاندنی کاتییان پێکهێنا تا پێشکارییەکانی دەوڵەتی کاتی بۆ جێگرتنەوەی رژێمی پاشایەتی فەراهەم بکا. کۆمیتەیەك لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازان بەو کۆمەڵە کەسەوە پەیوەست بوون. ئەو کۆمیتەیە کە لە شۆڕشی ١٩٠٥دا چالاك بوو، پاش تێکشکانی ئەو شۆڕشە، چوو بووە حاڵەتی خەڵوەتەوە، و ئێستا لە ناکاو لاوێتی خۆی زیندوو دەکردەوە. ئەندامانی ئەم کۆمیتەیە لە بارەی هاوکاری لەگەڵ حکوومەتی نوێدا، لێکترازان لە نێوانیاندا سەریهەڵدا. رادیکاڵە سۆسیالیستەکان لە هاوکاری لەگەڵ دەوڵەتی کاتیدا نەفرەتیان دەهاتەوە، چونکە بە باوەڕی ئەوان کارێکی لەم بابەتە پشتیوانیکردن لە دەوڵەتێك بوو کە هیچی وا لە رژێمی پاشایەتی باشتر نەبوو. هەڵسووراوترین رادیکاڵەکان، بەڵشەفیکەکان بوون، ئەوانە ئەو گروپە بوون کە لە حیزبی سۆسیال دیموکراتی کرێکاری روسیا هاتبوونە دەرەوە و جیاببوونەوە، چونکە لەو باوەڕەدا بوون کە حیزبی ناوبراو بە ئاستی پێویست رادیکاڵ نییە.





## راسپۆتین

*یەکێك لە کەسایەتییە بەناوبانگەکانی دەرباری پاشایەتی نیکۆڵای دووەم، پیاوێکی بێشەرم و شێت بوو بە ناوی راسپۆتین لە میانەی ئەو ماوەیەدا کە تزارینا ئەلکساندەرا، هاوسەری نیکۆڵای دووەم، سەرپەرشتی کارەکانی حکوومەتی دەکرد بە راوێژکاری خاوەننفووزی شاژن دەژمێردرا، و ئەمە لە کاتی نائامادەیی تزاردا بوو کە لەو سەردەمەدا لەگەڵ سەربازەکانی لە شەرگە بوو. گروپێك لە پیاوە نەجیبەکانی روسیا لەوە دەترسان بە هەلومەرجێکی ئاوا کارەسات و گرفتارییەکی گەورە بێتە پێشەوە، بڕیاریاندا راسپۆتین بکوژن.*

*رۆبیرت مسی بیۆگرافی نووس، رەوتی ئەم کوشتنە نەزانانە لە کتێبی نیکۆڵای و ئەلکساندرا بەم شێوەیە باس دەکا:*



راسپوتین، کەسایەتی پڕ لە نهێنی روسی و جێگا بایەخی دەربار، خێزانەکەی خۆی بەجێهێشت و خۆی بۆ مەزهەب تەرخان کرد

*شازادە یوسوپف کە لەگەڵ قوربانییەکەی خۆی، راسپۆتین دا، لە ژێر زەمیندا بە تەنیا بوون، بە حاڵەتێکی دەمارگرژییەوە چەند دانە کێکی ژەهراوی پێشکەش کرد، راسپۆتین نەیخوارد، بەڵام پاشان رای خۆی گۆڕی و دوو دانە کێکی بە پەلە قوتدا، یوسوپف چاوی تێبڕی بوو، چاوەڕێ بوو راسپۆتین بەدەم دەردو ئازارەوە لە پەلوپۆ بکەوێ، بەڵام هیچ شتێك رووی نەدا، پاش ئەوە راسپۆتین داوای شەرابی کرد، شەرابەکەش هەر ژەهراوی بوو. دوو پەرداخی هەڵدا، دیسانەوە کاری لێ نەکرد. یوسوپف بە نائومێدییەوە بە پەلە چووە نهۆمی سەرەوە تا لە دۆستانی پیلانگێڕی خۆی بپرسێ کە چی بکا... ئەو هەموو توانای خۆی کۆکردەوە و خۆیەخشانە بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ ژێر زەمینەکە و بە کوشتنی راسپۆتین کۆتایی بە کارەکە بهێنێ. یوسوپف لە حاڵێکدا کە دەمانچەیەکی لە پشت خۆیەوە شاردبۆوە لە قاڵدرمەکان هاتە خوارەوەو بینی راسپۆتین دانیشتووە، و بە سەختییەوە هەناسە دەدا و لە هەمانکاتیشدا هێشتا داوای شەراب دەکا... راسپۆتین بە چاوانی درەوشەدارییەوە چاوی لە شازادە بڕی بوو، یوسوپف تەقەی لە راسپۆتین کرد... راسپۆتین هاواری کردو بە پشتدا کەوتە سەر کەوڵە ورچێکی سپی و بەربۆوە. ساتێك پاشتر... روخساری راسپۆتین وێك هاتەوە، پێڵوی چەپی کەوتە لەرزین... کەف لە دەمی هاتەدەر... لە ناکاو لە جێگای خۆی راپەڕی، گەرووی قاتڵەکەی گرت و یەکێك لە کەتافیەکانی سەرشانی هەڵکەند. {پاش ئەوە راسپۆتین لەماڵەکە هەڵات و پەیتا پەیتا کەوتە بەرلێدانی گوللە} سەرەنجام کاتێك کە کەوتە سەر بەفرەکە و بەفرەکەی بە خوێنی خۆی سوورکرد، لاشەکەیان لە قوماشێکی شینەوە وەرپێچاو گوریسێکیان بە دەوریدا پێچا. کونێکیان لە رووباری سەهۆڵبەستوی نیوا کرد، و بە پێپەستان لاشەکەیان تێهاویشت. سێ رۆژ پاشتر، کە لاشەکە دۆزرایەوە، سییەکانی راسبووتین پڕ لە ئاو بووبوون. گریگوری راسپۆتین، کە گشت دەمارەکانی پڕ لە ژەهر بوو و لەشی بە هۆی گوللەی زۆرەوە کون کون ببوو، بە هۆی خنکانەوە گیانی لە دەستدابوو.*





ئەلکساندەر کیرنسکی سەرۆکی دەوڵەتی کاتیی

سۆسیالیستە نا بەلشەفییەکان، پشتیوانییان لە ئەندامێکی گرنگی دەوڵەتی نوێ دەکرد: ئەلکساندەر کیرنسکی، سۆسیالیستی میانڕۆ کەپێشان ئەندامی ئەنجوومەنی دوما بوو. ئەو پۆستی وەزارەتی دادی قبووڵ کرد. یەکەمین رابەری دەوڵەتی کاتی شازادە گ-ئا. لیوفیف بوو. بەڵام رابەری واقیعی دەوڵەتی کاتی کیرنسکی بوو نەك لیوفیف. کیرنسکی لە لاویدا بۆ ئەوەی کە ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراوی هەڵبژاردبێ، بە(حیزبی سۆسیالیستە شۆڕشگێڕیە رادیکاڵەکانەوە) پەیوەست بوو. لە رۆژانی هەوەڵی شۆڕشدا، ئەم حیزبە دروست بە ئەندازەی بەلشەفییەکان بە گرنگ چاوی لێ دەکرا و کیرنسکی خۆی بە پردی نێوان رادیکاڵەکان و میانڕۆکان دەزانی. بەڵام هیچ رابەرێکی شۆڕشگێڕ لە ئاوا هەلومەرجێکدا نەیدەتوانی ئەو پێگەیە بپارێزێ و لە راستیدا رادیکاڵەکان و میانڕۆکان، وێڕای هەبوونی ئامانجی هاوبەشیان لە سەرەنگون کردنی رژێمی پاشایەتی، هەر لە سەرەتاوە بە خوێنی یەکتری تینووبوون.

مێژوونووسان، کیرنسکی یان هێندە بە لێهاتوو بۆ رابەری نەزانیوە، بەڵام (ریچارد پایپس)ی مێژوو نووس، خۆشەویستی سەرەتایی ئەو، بۆ ئەنجامی ئاخاوتنە پڕ لە هەست و گەرمەکانی ئەو دەگێڕێتەوە، ئاخاوتنگەلێکی ئاوا کە دەیتوانی کۆمەڵێك راپەڕێنێ. پایپس یەکێك لە ئاخاوتنەکانی کیرنسکی کە بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازان پێشکەشی کرد بوو، لە زەمەنێکدا بوو پۆستی وەزارەتی دادی لە دەوڵەتی کاتیدا داوادەکرد، بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە ((ئەو بەڵێنی شەرەفی دا کە بە ناونیشانی وەزیر، هەرگیز ناپاکی لەگەڵ ئامانجە دیموکراتییەکاندا نەکا. ئەو بە هەمان شێوازی گەرم و گوڕو هەست هەژێن هاواری کرد، من ناتوانم بێ خەڵك بژیم. ئەگەر بۆ ساتێکیش گومانتان لە من کرد، وەرن بمکوژن! پاش راگەیاندنی ئەم وشانە، کەوتە سەر رێگای گزی و لاوازی! کارەکەی ئەو لە خۆنمایشکردن بەولاوە شتێکی تر نەبوو، بەڵام کاریگەر بوو.))(٧)

هەر لەو سەرەتایەوە، دەستێوەردانی ئەنجوومەنەکان لە ڕێگای کۆمیتەکانی ڕاپەڕاندنەوە، کە بە ئیسپۆلکۆم ناودەبرا، بەربەستی لە ڕێگای چالاکی دەوڵەتی کاتیدا پێکهێنا. گەرچی ئەنجوومەنەکان بە ڕواڵەت کارێکیان بەسەر چالاکییەکانی حکوومەتی ناوەندییەوە نەبوو، وەك چاودێر و جاسووسی ((نارەسمی)) ئاڵۆزی و شێواوییان لە کارەکانی حکوومەتدا پێکدەهێنا و کێشە و بەرەیان دەنایەوە.

بۆ نموونە لە مانگی مارتدا، لەسەر پێداگریی ئیسپۆلکۆم حکوومەتی نوێ فەرمانێکی بە ناوی ((فەرمانی ژمارە یەك)) دەرکرد، ئەم فەرمانە، کە یەکەمین فەرمانی دەوڵەت بوو، سوپای دیموکراتیزە دەکرد و مۆڵەتی دەدا کە لەوێدا هەڵبژاردن بەڕێوەبچێت و نوێنەرانی خۆیان بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازان بنێرن. لە لایەکی ترەوە، زۆر لە زنجیرەی خاوەن پلەکانی سوپای هەڵدەوەشاندەوە. هەروەها لە هەمان مانگدا، مانگرتنەکان کۆتاییان هات و ئەوانەی کە لە سەردەمی حکوومەتی تزاردا دەستبەسەرکرابوون، بەخشران ئێستا ڕابەرانی شۆڕشگێڕ کە لە وڵات ڕایان کردبوو دەیانتوانی بگەڕێنەوە.

## گەڕانەوەی دوورخراوەیەك

لە نێو ئەو ڕادیکاڵانەی کە دوورخرابوونەوە و جارێکی تر لە گۆڕەپانی شۆڕشدا وەدەرکەوتنەوە فلادیمیر ئیلیچ ئولیانۆف بوو کە بە لینین ناوبانگی ڕۆیشتبوو و لە کاتی شۆڕشدا لە سویسرا بوو. لینین ماوەیەکی زۆر ڕابەری پڕ لە ناوودەنگ و بەرجەستەی سۆسیالیستەکان بوو، ڕۆژی سێیەمی نیسان گەیشتەوە ناو پەترۆگراد.

لینین، ستراتیژوان و تیۆریی وانی هوشیار و شۆڕشگێڕ، بۆ چەسپاندنی دووبارەی دەسەڵاتی خۆی لە نێو کرۆکی بنەڕەتی ڕادیکاڵەکاندا، باڵی بەلشەفیکی حیزبی سیوسیال دیموکراتی کرێکاری ڕوسیا، هیچ کاتی بە فیڕۆنەدا. ئەو پاش گەڕانەوە، دەسبەجێ کەوتە ئاخاوتن و لێدوان بۆ گروپێك لە

**لینین، کومۆنیستی ڕوس و ڕابەری بەلشەفیکەکان**



ڕابەرانی بەلشەفیك، لەوێدا چەندین جار نەخشەی خۆی بۆ سەرکەوتنی شۆڕش، دووبارە کردەوە. ئەم ئاخاوتنانە بە ناوی ((تێزەکانی نیسان))ەوە ناسراون.

## ((تێزەکانی نیسان)) یا مانیفێستی لینین

تێزەکانی نیسان، پوختەی نەخشەی لینین بۆ بەدەستهێنانی جڵەوی شۆڕش و بە دەسەڵات گەیاندنی بەلشەفیکەکان بوو. ئەو دەیزانی ئامانجەکان لە ژێر سایەی حکوومەتی دەوڵەتی کاتی کە ئەو کاتە لەسەرکاربوو، بە دەستنایەن. چاوەڕوانیی ئەوە نەدەکرا لە دەزگایەکدا کە سەرۆکەکەی نەجیبزادە، شازادە لیوفیف و سیاسەت وانی ڕوس کە لە چینی ناوەڕاست بوو مەبەستی کیرنسکی، بوون، بەرنامەکانی بەلشەفیکە ڕادیکاڵەکان بەرەو پێشەوەبچن یان لە واقیعدا ڕێگا بدەن لینین نفووزێکی زۆر بە دەست بهێنێ.

بەو پێیە، لینین، لە جیاتی پشتیوانی لە حکوومەتی کاتی، و لە ئەنجامیشدا، زامنکردنی مانەوەی ئەو حکوومەتە،داوای لە بەلشەفیکەکان کرد کە دەست لە پشتیوانیکردنی حکوومەت بکێشنەوە. ئەو هیوادار بوو ئەم هەنگاوە ببێتە هۆکاری تێکشکانی حکوومەتی لیوفیف- کیرنسکی، و لە ئەنجامدا، هەلومەرجێکی وا بۆ بەلشەفیکەکان فەراهەم ببێ تا جێگای ئەوان بگرنەوە.

مەرجی تری مانیفێستی لینین ئەوە بوو، کە ڕوسیا لە جەنگی یەکەمی جیهانی بێلایەن بووەستێ. جەنگ مایەی بە فیڕۆدان و نابووتکردنی بەرهەمەکان و پاشەکەوتەکانی بوو و هەروەها جووتیارانیشی لە مەزراکانیان دووردەخستەوە و ڕەوانەی شەڕگەی دەکردن.داخوازی لینین بۆ بێلایەن بوون لە جەنگ، خۆشەویستی ئەوی ڕووبەزیادبوون کرد، بەو پێیە لە سەرتاسەری وڵاتدا، پشتیوانیکردن لە بەلشەفیکەکان زیاتر بوو.

بەشێك لە مەرجەکانی تێزەکانی لینین بە تەواوی لە واقیع دووربوو. بۆ نموونە ئەو دەیویست پۆلیس، سوپا و سیستەمی بیرۆکراتی کۆنینەی دەوڵەتی هەڵبووەشێتەوە. بەڵام دوو بوار لە تێزەکانی ئەو کە سەرەنجام هۆکاری پێکهاتنی ڕژێمی بەلشەفیکەکان ودامەزرانی یەکێتیی سۆڤێت بوون، بریتی بوون لە داخوازی لینین بۆ میللی کردنی زەوی و زار و پێکهێنانی کۆمارێك لە ئەنجوومەنەکان بوو؛ لەو چوارچێوەیەی حکوومەتدا زنجیرەیەك پلەدار فەرمانڕەوا بوون کە لە ئەنجوومەنە ناوچەییەکانەوە دەستیپێکرد و لە ئەنجوومەنی باڵاو دەسەڵاتی ناوەندی کۆتایی دەهات.

کۆمیتەی ناوەندی بەلشەفیکەکان بەیاننامەیەکی لە دژی ئەم تێزانە دەرکرد و کۆمیتەی پارێزگاکانی بەلشەفیکەکانیش هەر پرۆتیستۆی کرد. بە هەموو ئەو حالانەشەوە پێگەی رابەریی لینین ئەوەندە مەحکەم بوو، کە ئەو تێزە ناوبراوانە لە نێو دەستەی بابەتە رەسمییەکانی بەلشەفیکەکان جێی گرت. لەو هەلومەرجانەدا، کەسایەتییەکی گرنگی تری شۆڕش خۆی ئامادە دەکرد تا بگەڕێتەوە بۆ روسیا.

## دوورخراوەیەکی تر دەگەڕێتەوە



**لیون. د. تروتسکی سوپای سووری دامەزراند**

لە سەرەتای مانگی مایسی ١٩١٧ رابەرێکی تری شۆڕش کۆتایی بە سالآنی دووخرانەوەی خۆی هێنا. لیون. د. تروتسکی، رابەری گروپی مەنشەویکەکانی میانرۆی حیزبی سۆسیال دیموکراتی کرێکارانی روسیا، لە نیویۆرکەوە گەڕایەوە بۆ روسیا، لە سەرەتای شۆڕشدا، تروتسکی بە ئەندازەی لینین نفووزی لە نێو حیزبدا هەبوو. ئەم مارکسیستە تێکۆشەرە، کە سوپای سووری دامەزراند، بە جۆرێکی گشتی بە میانرۆ دەناسرا، چونکە رێبازێکی کە ئەو بۆ گەیشتن بە سۆسیالیزم پێشنیاری دەکرد، بە بەراورد لەگەڵ رێبازی لینین و بەلشەفیکەکان گونجاوتر بوو و زیاتر لایەنی پلە بە پلەی هەبوو. بەتوانایی تروتسکی بۆ رێککەوتن لەگەڵ لینین، بە هۆکارێکی گرنگ بۆ سەرکەوتنی کۆتایی بەلشەفیکەکان، دەژمێردرا. لە ساتەکانی قەیراندا ئەو کاتەی کە یەکێتیی بۆ سەرکەوتن



کارێکی چارەنووساز بوو، تروتسکیی میانرۆ دەیتوانی قەناعەت بە هاورێبازەکانی خۆی بکا کە جیاوازییە ئایدیۆلۆژییەکانی خۆیان، لەگەڵ بەلشەفیکەکاندا بخەنە لاوە و پشتیوانی لە لینین بکەن.

لە روانگەیەکی تەواو کردەنییەوە، جیاوازی لێڕوانینی بنەڕەتی لە نێوان تروتسکیی میانرۆ و لینینی رادیکاڵدا ئەوە بوو، کە تروتسکی مەیلی بەلای ئەوەدا بوو کە هاوکاری لەگەڵ دەوڵەتی کاتیدا بکا. بەو پێیەش جێگای سەرسوورمان نەبوو کە لە کۆتاییدا ئەو دوو رابەرە هاوکاری یەکتری بکەن.

## شێوەگرتنی دەوڵەتی ئیئتیلافی



**کیرنسکی (ناوەڕاست) لە شەرگەی جەنگ هانی سوپاییەکانی دەدا**

لە یەکەمین مانگەکانی سالّی ١٩١٧، بەشی زۆری چالاکییە شۆڕشگێڕییەکان لە مۆسکۆ و پەترۆگراد چڕببوونەوە، بەلام لە مانگی مایسی ئەو ساڵەدا بێسەروبەری و پاشاگەردانی لە سەرتاسەری ولاتدا فەرمانڕەوا بوو. گروپە شۆڕشگێڕەکان لە مانگی مایسدا لە دەوری یەکتری بوون ئیئتیلافکیان لە نێوان خۆیاندا پێکهێنا. ئامانجی بنەڕەتی ئەو ئیئتلافە، رێکخستنەوەی دووبارەی سوپاو کۆنترۆڵ کردنی چالاکییەکانی روسیا بوو، کیرنسکی بە سەرکێشییەوە بەسەر شەرگەکانی جەنگ راگەیشت و، هەولیدا هەستی نیشتمانپەروەری سەربازان جۆش بدا. بەلام لە ئەنجامی ((فەرمانی ژمارەیەك))و بێسەروبەری و پاشاگەردانی کە یەخەی ولاتەکەی گرتبوو، یاساو دیسپلین ئەوەندە لە پاشەکشێدا بوو، کە تکاوداوای هەست گەرمانەی کیرنسکی وەلامێکی پێ نەدرایەوە و ئاژاوە و شێواوی پەرەی گرت.

لینین و تروتسکی لە ناوەڕاستی حوزەیراندا یەکێتییەکیان لە نێوان بەلشەفیکەکان و مەنشەویکەکان پێکهێنا کە ئاکامەکەی بریتی بوو لە زیادبوونی نفووزی بەلشەفیکەکان و هەروەها دەسەڵاتی ئەوان بۆ گۆڕینی ڕێبازی شۆڕش بەرەو سۆسیالیزم بوو.

مانگی حوزەیران بە کۆتایی دەهات کە سوپاییانی روس لە لۆۆ لە ناوەڕاستی گالیسیا[٢] نەمساوییەکانیان تێکشکاندو دەیان هەزار ئەسیریان گرت، بەڵام بە زوویی ئەم سەرکەوتنە لێیان بوو بە تاڵاو، و ئەمە ئەو کاتە بوو کە سوپاییانی ئەڵمانی بەهێرشێکی بەربڵاوەوە بۆ رزگارکردنی نەمساوییەکان بەخۆکەوتن. سەربازانی روس، نارێك و پێك، بێ کەرەسەو ئەسباب و برسی بە شێوەیەکی پەرت و بڵاو پاشەکشێیان کرد. ئەم نارێکوپێکییە نائارامییەکانی روسیای پتر پەرەپێدا و رووداوێك شێوەی وەرگرت کە بە رووداوی ((ڕۆژانی ژوئیە)) ناسرا.

## ڕۆژانی ژوئیە

پاشەکشێی کارەساتبار لە بەرامبەر سوپای ئەڵمانیا لە ناوچەی لۆۆ کاریگەرییەکی هاندەرانەی لەسەر نائارامییەکانی مانگی ژوئیە دانا، و بێ نیزامی و بێ یاسایی گەیشتە قۆناغێکی مەترسیدار. لە سێیەمی ژوئیەدا، شۆڕشێکی دژ بە دەوڵەت لە پەترۆگراد دەستیپێکرد.

کیرنسکی کە لە لێواری بەدەستهێنانی پلەی سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی کاتی بوو، باوەڕی وابوو کە ئەڵمانەکان پێش وەخت زانیارییان هەبوو، کە بڕیار وایە شۆڕش لە پایتەخت رووبدا، و لینین و هەموو بەلشەفیکەکان هۆکار و بنیاتنەری ئەم ئاژاوەیە و هەروەها ئاگاداری ئەڵمانەکانیش لە بارەی ئەم رووداوەن. بۆ پێشبڕینەوە لەم کارە کیرنسکی فەرمانیدا بەلشەفیکەکان دەستگیر بکەن و رۆژنامەکانی ئەوانیش رابگرن. لینین چوو بۆ فیلەندا لەوێ. هەروەها رابەرانی تری بەلشەفیکیش دەستپێشکەرییەکی هاوچوونی ئەمەیان کرد.

٢- Galicia ناوچەیەکی مێژووییە لە باشووری رۆژهەڵاتی پۆلۆنیا و رۆژئاوای ئۆکراین هەڵکەوتووە.



**نەزمێکی نوێ لە کارگەکاندا**

*کۆمیتەکانی کرێکاران کە لە ئەنجامی کودەتای ١٩٠٥ پێکهاتبوون، بە دەستپێکردنی کودەتای ١٩١٧ رێنوێنی زۆریان لە بارەی رەوتەکانەوە لە کارگەکانی پەترۆگرادەوە بەردەستکەوت. ئەم جوولانەوەیە نفووزی سۆسیالیستەکانی لە شۆڕشدا مەحکەم کردبوو، دیڤید ماندل لە کتێبی کرێکارانی پەترۆگرادو روخانی رژێمی پێشوودا، کاروکردەوەی ئەو کۆمیتانە بەم شێوەیە وەسف دەکا:*

*داخوازی هەڵبژاردنی نوێنەران لە نێو کارگەکاندا مێژوویەکی زۆر درێژی هەیە، و لە راستیدا، هەتا پێش شۆڕش چەندین ((ئەنجوومەنی ریش سپییان)) کە روویەکی نیوە یاساییان هەبوو، لە چەند کارگەیەکی گەورەدا پێکهاتبوون. ئەم کومیتانە بە ناونیشانی نوێنەرانی کارگەران لە بەرامبەر خاوەن کارەکاندا چالاکییان دەنواند. رێکەوتننامەی ١٠ی مارتی ١٩١٧ لە نێوان ئەنجوومەنی {نوێنەرانی سەربازان و کرێکاران} و خاوەنانی {کارگەکان} ، ئەم کۆمیتانەی بە یاسایی راگەیاند، و ئەو دەرەتانەی رەخساند کە لە هەموو ناوەندە پیشەسازییەکاندا ئەم کۆمیتانە بەرپا بکرێن... ئەوانە تا رادەیەك لە هەرجێیەکدا کونترۆڵی هەلومەرجی نێوخۆیی بکەن. گەوهەری ئەنجامگیریی کردن لە بەرقەرارکردنی رژێمی نوێ لە کارگەکاندا هەمان ئەو کارە بوو.*

شۆڕشەکانی رۆژانی ژوئیە، هۆکاری سەرهەڵدانی جیاوازیگەلێکی سەرەکی بوو لە نێوان ئەو گروپانەدا کە مەبەستیان ئەوە بوو لە پاش شۆڕش، نفووزی خۆیان بەکاربێنن. لەو نێوانەدا، بە تایبەتی لینین هەستیکرد کە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە پەیوەندی خۆی لەگەڵ گروپە نا بەلشەفیکەکاندا بپچڕێنێ. لە کۆتایی ژوئیەدا، کە کۆنگرەی بەلشەفیکەکان پێکهات، لینین لە فیلەندەوە پەیامی نارد کە ئیدی زەمەنی هاوکاری لەگەڵ باقی بەشداران لە شۆڕشدا بەسەرچووە. بەلشەفیکەکان دەبێ خۆیان بەرێی خۆیاندا بڕۆن.

## بەڵشەفیکەکان بۆ دەست بەسەرداگرتنی دەسەڵات ئامادە دەبن

لە حاڵێکدا سەربازان و کرێکاران بە شێوەیەکی ئاشکرا متمانەیان لە دەوڵەتی کاتی کیرنسکی دەستاندەوە، نەخشەی بەلشەفیکەکان بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات کردەنی تر دەهاتە بەرچاو وێڕای ئەوەش، بەڵشەفیکەکان راڕابوون. پاش ئەوەی شۆڕشەکانی مانگی مایس تین و تاوی پتریان ستاند، زۆرێك لە سەربازانی رادیکاڵ ئامادەبوون لە سێیەمی حوزەیراندا لە دژی حکوومەت دەست بدەنە شۆڕش. بەڵام ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی بەلشەفیك ئەوانیان ناچارکرد کە بگەڕێنەوە بۆ سەربازگەکانی خۆیان. پاش ئەوە، کۆمیتەی ناوەندی، لە جوولانەوەی سەربازانەوە هێز و ورەی وەرگرتبوو، بەیاننامەیەکی دەرکرد و داخوازی ئەوەی راگەیاند کە دەوڵەتی کاتی لە ڕێگای زەبرو

زەنگەوە سەرنگون بکرێ. زۆر لە میانڕۆیانی ناڕازیی بۆ پشتیوانیکردن لە بەلشەفیکەکان راپەڕین. لە میانی هەمان ئەو شێواوییە کورتانەدا، لە شۆڕشی نان لە مانگی (فوریە) تا رۆژانی ژوئیە، حیزبی بەلشەفیك و هەروەها هێزی سەربازیی ((پاسەوانی سوور)) بە شێوەیەکی روو بە سەرەوە بە هێز دەبوون. لە مانگی مایسدا ئەم حیزبە نزیکەی هەشتا هەزار ئەندامی هەبووە لە مانگی ئوتدا ژمارەی ئەندامانی لە دووسەدهەزار تێپەڕی کرد. لەوانەیە بە لەبەرچاوگرتنی ولاتێك کە ژمارەی دانیشتوانی ملیۆنان کەس بوو، ئەم ژمارەیە بەکەم بێتەبەرچاو، بەلام بە بەراورد لەگەڵ هەموو گروپە شۆڕشگێڕییەکاندا، وا نەبوو. بەلشەفیکەکان بەرەو ئەوە دەچوون دەبوون بە هێزێکی سیاسی مەزن، و هۆکارێکی گرنگی بەهێزبوونی ئەوان، پشتیوانی هەرچی زیاتری جووتیاران بوو لە سەرتاسەری ولاتدا.

جووتیاران لەبەر خاتری فەلسەفەی کومۆنیستی نەبوو کە پشتیوانییان لە لینین دەکرد، ئەوان تەنانەت ژمارەیەکی کەمیشیان ئاگادارییەکیان لە بارەی ئەو فەلسەفەیەوە نەبوو، بەلام جووتیاران لەو باوەڕەدا بوون کە بەلشەفیکەکان دەیانەوێ زەوییەکان لەو ملکدارە گەورانە بستێننەوە و بیدەنە ئەو جووتیارانە کە پشتاوپشت لەسەر ئەو زەوییە گەورانە کاریان کردوە. ئەوان نەیاندەتوانی پێشبینی بکەن کە بەلشەفیکەکان لە زەرفی ماوەیەکی کورتدا لە ژێر ناوی ((سۆسیالیست کردنی زەوی و زار))دا دووبارە زەوییەکانیان لێ دەستێننەوە. لە میانی ئەو قۆناغەدا، جووتیاران پشتیوانی لینین بوون. پشتیوانی ئەوانیش بە رۆڵی خۆی دەرەتانی بۆ لینین فەراهەمکرد کە سازشکردن بخاتە ئەولاوە.

بەلشەفیکەکان لە کاتی شۆڕشی مانگی فوریە، چەند مانگێکیان بۆ فەراهەم کردنی پشتیوانی گشتی تەرخانکرد و ئەمەش نە تەنیا هەر بۆ بەدەستهێنانی دەسەلات، بەلکو بۆ پاراستنیشی پێویست بوو. سەرەنجام بە پشتیوانییەکی زۆروزەبەندەوە بەلشەفیکەکان ئامادەی کار بوون.

## شۆڕشی ئوکتۆبەر

بەسەرسامییەکی زۆرەوە، سەرکەوتنی کۆتایی بەلشەفیکەکان بە ئاسانی بەڕێوە چوو. قۆناغە بنەڕەتییەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە دەستی تروتسکی خرایە واری پیادەکردنەوە، چونکە لینین هێشتا لە حەشارگە بوو، و ترسی لەوە هەبوو نەوەکو دیسانەوە هەمان لێکترازانی رۆژانی تەمووز لە نێوان ناڕازییەکانی دەوڵەتی کاتی رووبداتەوە. تروتسکی بە ناونیشانی سەرۆکی کۆمیتەی سەربازیی شۆڕش و سەرۆکی ئەنجوومەنی بە هێزی پەترۆگراد لە گۆڕەپانەکەدا دەدرەوشایەوە. لە کەش و هەوای بێ سەروبەرو پاشاگەردانی شوبات تا تشرینی یەکەمی ١٩١٧، ژمارەیەکی سەرتاسێنەر لە ئەنجوومەنەکان، کۆمیتەکان، کەرتەکان، ئیئتلافەکان و باقی گروپە فەرمانڕەواکان، هەوڵیاندا تا جێ پێیەك لە نێو دەسەلاتدا بۆ خۆیان خۆش بکەن. تەمەنی هێندێك لەو دامەزراوانە لە چەند رۆژێك زیاتر تێپەڕی نەدەکرد.



### تێکشکانی ئانارشیستێك

*ئیما گوڵدمن، ئانارشیستی ئەمریکی کە لە روسیا لەدایکبوو بوو لە ساڵی ١٩١٧ بۆ روسیا گێڕدرایەوە ئەو لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی تێکشکانی من لە روسیا هەستی بێ پێچ و پەنای خۆی لە بارەی ژیانی پاش شۆڕش بەم شێوەیە راڤە دەکا:*

*نێزیك بە گشت ئەو کەسانەی کە دیدارم لەگەڵدا دەکردن، هەرچەندە لە باری سیاسییەوە جیاوازییەکی بەرینی بیروباوەڕیان هەبوو، یەك تاکە چیرۆکیان بۆ من دەگێڕایەوە، چیرۆکی شەپۆلی مەزنی شۆڕش، ورەی (سەرسامهێنەر) کە هەموو خەڵکی بەرەو پێشەوە برد، دەسەلاتی خەڵکەکان، رۆڵی بەلشەفیکەکان وەك نوێنەرو وتاربێژی شۆڕشگێڕانی هەرەتوندڕەو، و دوا جار ناپاکی کردن لە شۆڕش دوای بە دەست هێنانی دەسەلات، بوو... ئەوان قسەکانی خۆیان بە {زۆرێك} لە شایەت و بەڵگەوە تەئید دەکردەوە... لە بارەی سەرزەنشت کردن و ئازاری هاوڕێیانی خۆیانەوە قسەیان دەکرد. لە بارەی گوللەبارانکردنی پیاوان و ژنان، تاوانی بێ بەرو بەرهەم، لە وێرانی و تێکدان.*

*زۆر تری رەوشەکانی {فەرمانڕەوایی بەلشەفیکەکان} لە پەی نەبردن بە خوونەریتی خەڵکی روسیا و پێداویستییەکانی ئەوانەوە سەرچاوە دەگرێ، و هەروەها لە دڵگەرمی سەرشێتانەی ئەوان بۆ دیکتاتۆری کە تەنانەت دیکتاتۆری پرۆلیتاریاش نییە، بەڵکو دیکتاتۆری گروپێکی بچووکی پرولیتاریا.*



*کاتێك من مەسەلەی ئەنجوومەنەکانی خەڵك و هەڵبژاردنم دێنایە پێشەوە، میوانەکانم زەردەخەنە دەیگرتن. ((هەڵبژاردن! شتی وا لە روسیا بوونی نییە مەگەر هەڕەشەو تروریزم بە هەڵبژاردن ناو بنێی.)) بەو زەمینە خۆش کردنانە کە بەلشەفیکەکان دەبنە خاوەنی زۆرینە. چەند تاکێك لە مەنشەویکەکان، شۆڕشگێڕی سۆسیالیست یان ئانارشیست مۆڵەتی ئەوەیان هەیە بخزێنە ناو ئەنحومەنەکانەوە، بەلام ئەوانە چانسی ئەوەیان نییە کە کەسانێك پەیدا بن گوێ بۆ قسەکانی ئەوان بگرن.*

**ئیما گولدمن، ئانارشیستی پڕ لە جۆش کە ماوەیەکی زۆر درێژ لە هەوڵی شتگەلێك دابوو، کە لەگەڵ رەزامەندی گشتیدا نالێك بوو.**

ریچارد پایپس لەو باوەڕەدایە کە شۆڕش لە دوو قۆناغـدا روویـدا: یەکـەمیان لـە مـاوەی رووداوەکانی نیسان و تەمووزدا، و پاش ئەویش، لە ئوکتۆبەردا، کە کودەتای کۆتایی بوو. ئـەو لەمبارەیـەوە دەنووسـێ: ((لـە قۆنـاغی یەکەمـدا لیـنین هەوڵیـدا لـە پـەتروگراد لـە رێگـای خۆپیشاندانی سەر شەقامییەوە، کە بە هۆی هێـزی چـەکدارەوە دەپـارێزرا، دەسـەڵات بگرێتـە دەست)) رابـەری قۆنـاغی دووەم تروتـسکی بـوو، چـونکە لیـنین هێـشتا لـە فیلەنـدا ژیـانی دەبردەسەر. تروتسکی ئامادەسازییەکانی بەلشەفیکەکانی بۆ بە دەستەوەگرتنی دەسـەڵات، لـە پشت کۆنگرەی ئەنجوومەنەکانەوە {کە ساختەو نایاسایی بوون} شاردەوە، لە حاڵێکدا کـە لـە ژێرەوە پشتی بە هێزە تایبەتییە چالاکەکان بەسـتبوو تـا ناوەنـدە بنەڕەتییـەکانی حکوومـەت کۆنترۆڵ بکا.)).[٨]

لە ٢٤ی ئوکتۆبەردا، لینین لە حەشارگەکەی خۆیـەوە سـەری هێنایـەوەدەر و فەرمانـدەیی سەرەنگون کردنی دەوڵەتی کاتی بە دەستەوە گرت. لەو شـەوەدا بەڵـشەفیکە شۆڕشـگێڕەکان، کۆنترۆڵی پردەکان، هێڵەکانی رێگای ئاسن و هێڵەکانی تەلەفۆنیان گرتە دەست. کیرنسکی، کە لە کۆشکی زستانە بوو، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە دەوڵەتی کاتی ئەو لە حـاڵی رووخاندایـە، و دەستیکرد بە ئامادەسازی کردن بۆ هەڵاتن، ئەویش نە تەنیا هەر لەو کۆشکە، بەڵکو لە وڵات، ئەو تا کاتی رووخانی دەوڵەتی کاتی، رابەری حکوومەت بوو، بەڵام سەرەنجام بـەرەو نیویـۆرك، ئەو جێیەی کە لەوێدا ژیانێکی مامناوەندی و ئارامی تا کاتی مردنی لـە سـاڵی ١٩٧٠ تێـدا بەسەربرد، هەڵهات.

هەموو ئەندامانی تـری دەوڵـەتی کـاتی دەسـتگیرکران. شۆڕشـی ئوکتۆبـەر، و لەواقیعـدا شۆڕشی روسیا، بە شێوەیەکی بنبڕ کەوتبووە بەردەسـتی بەلـشەفیکەکان، بەتایبـەتیش لیـنین. هەر بەو ئاوایە کە روبێرت دانیلی، مێژوونووس، دەڵـێ: ((هـەروەکو جێگـۆڕکێی حکوومـەتی تزاری بۆ دەوڵەتی کاتی، گواستنەوەی دەسەڵات بۆ ئەنجوومەنـەکان، تـا رادەیـەك لـە هـەموو وڵاتدا بە کەمێك توندوتیژییەوە، بە خێرایی قبوولّ کرا.))[٩].

بەو حاڵەوە، هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات بەکۆتا نەهاتبوو، چونکە هێشتا دەبووایە بەلشەفیکەکان پێگەی خۆیان مەحکەم بکەن. پێش ئەوەی لیـنین بتوانـێ بـە شـێوەیەکی بنـبڕ کونترۆڵ کردنی وڵات بخاتە نێو چنگی خۆیـەوە، بەداخـەوە جـەنگێکی نـاوخۆیی خوێنـاوی لـە بەردەم خەڵکی روسیا بوو.







## (٢)

## سەردەمی لینین ١٩١٧- ١٩٢٤

گومانی تێدا نییە لینین، رابەری بەلشەفیکەکان، لە شۆڕشدا سەرکەوت. تاکتیکە سەرکەوتووەکانی ئەو بریتی بوون لە هەڵوەشانەوەی ئەنجوومەنی نوێنەران، راگەیاندنی بەڵێنی درۆ و دواجاریش پشتگوێخستنی کەسە نارازییەکانی خۆی بوو. لینین بەڵێنی دیموکراسیدا و رژێمێکی توتالیتری سەرکوتگەری دامەزراند. ئەو، بەڵێنی دووبارە دابەشکردنی زەوی بە جووتیاراندا و کێڵگەی سۆسیالیستی دەوڵەتی پێ سپاردن. لینین بەڵێنی بەو هەرێمە غەیرە روسییانە کە پێشتر ئیمپراتۆری روسیاداگیری کردبوون، دا کە سەربەخۆییان بداتێ، کەچی کۆماری سۆڤێتی هێنایە ئارا. ئەو زەمینەی هەموو حکومەتە کۆمۆنیستییەکانی داهاتووی فەراهەم کرد.



**لینین بە فەراهەم کردنی زەمینەی هەموو حکومەتەکانی داهاتووی کۆمۆنیست لە شۆڕشدا سەرکەوت**



یان گیری مێژوونووس، ئامانجی دەسبەجێی لینین پاش گەیشتن بە دەسەڵات بەو شێوەیە وەسف دەکا: ((لینین لە دەوڵەت و شۆڕشدا چەند قۆناغێکی بەوردییەوە رێکخست و هێنایەئارا کە بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگەی سەرمایەداری و پێکهێنانی رژێمی نوێ پێویست بوو... ئەو دەیزانی کە دەبێ زووبەزوو لە رێگای پشتیوانی گشتی خەڵکەوە، بە تایبەتی جووتیاران، پێگەی حیزب بەهێز بکا))(١٠).



**پاش شۆڕشی جووتیارانی برسی، لە نێو سەرەنوێلکەکاندا، بەدوای خواردندا دەگەڕێن**

بۆ سەرکەوتن، پێویست وابوو لینین پیشانی بدات، کە ئەو سەرقاڵی جێبەجێکردنی بەڵێنەکانییەتی لە بارەی زەوی و زار و ئاشتی. بەڵام بەڕاستی ئەو مەبەستی نەبوو چاکسازیی لە واری زەوی و زاردا بخاتە کارەوە. لە جیاتی ئەوە، هەوڵیدا جووتیاران بەوە رازی بکا کە ئامانجی بنەڕەتی ئەو مانای بە سۆسیالیست کردنی دەوڵەتییانەی زەوی، لەگەڵ هەمان دووبارە دابەشکردنەوەی زەویدا وەکو یەك وایە. بەڵام کارەکەی ئەنجامێکی نەبوو.

لەم جۆرە حاڵانەدا، پێش ئەوەی کە لینین بتوانێ بەڵێنەکانی خۆی کە بە جەماوەری خەڵکی دابوون، جێبەجێ بکا، هەوڵیدا کونترۆڵی حیزبەکەی بەسەر وڵاتدا مەحکەم تر بکا. شۆڕشی ئوکتۆبەر کۆتایی هەوڵدانی بەلشەفیکەکان بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات نەبوو.

## بەلشەفیکەکان دەگەنە دەسەڵات

شۆڕشی ئوکتۆبەر، کە فەرمانڕەوایی بەلشەفیکەکانی مەحکەم تر کرد، زیاتر جۆرێك چنگ گیرکردن لە دەسەڵات بە کودەتا بوو تا شۆڕشێکی واقیعی. تزار کەنارەگیرکرابوو و دەوڵەتی کاتیی کە هەوڵیدابوو جێگەی ئەو بگرێتەوە، بە جۆرێکی گشتی ببووە جێگەی قبووڵ کردنی گشت خەڵك. پاش ئەوەی بەلشەفیکەکان رابەرانی ئەم دەوڵەتەیان لە دەسەڵاتداگرتبوو و کونترۆڵی ناوەندی حکومەتیان لە پەترۆگراد بە چنگ هێنا بوو. هەرچەندە رابەرانی دەوڵەتی کاتی بە زۆرەملێ کەنارەگیرکرابوون، بەڵشەفیکەکان سەرکەوتنی سەربازییان بەدەستنەهێنابوو و هێشتا پێویستیان بە پشتیوانی بەرینی خەڵك هەبوو.

دوابەدوای سەرکەوتنی بەلشەفیکەکان و لە میانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، روسیا وەزعێکی ناسەقامگیری هەبوو. پیشەسازی تازە بە سەرپێ کەوتووی وڵات بۆدابینکردنی پێداویستییەکانی بەشەکانی سەربازی و نا سەربازی کرچ وکاڵ بوو. بەشی کشتوکاڵ کامڵ نەبوو بوو، و جەماوەری جووتیاران نەیاندەتوانی هەم لە شەڕگە خزمەت بکەن، هەم بپەرژێنە سەر کاری کشتوکاڵ، لە ئەنجامدا، کار لە هەردوو بەرەدا، لەنگ بووبووو.

زۆربەی خەڵکی روسیا نەخوێندەوار بوون و بە جۆرێکی سەرەکی لە هەژاریدا رەنجیان دەکێشا. رێگاکان، پردەکان، هێڵەکانی رێگای ئاسن و گشت خزمەتگوزارییە گشتی و خۆشگوزەرانییەکان لە ئاستێکدا بوون تا رادەیەك بوون و نەبوونیان وەکو یەك وابوو. بەو پێیە لە ئاستانەی بەرپاکردنی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکانی سەرتاسەری روسیا لە دوادواییەکانی ساڵی ١٩١٧ بەلشەفیکەکان لەگەڵ کۆمەڵە کێشەیەکی جیدیدا رووبەڕوو ببوون.

## لینین دەوڵەت پێکدەهێنێ

کۆنگرەی ئوکتۆبەر، کۆبوونەوەی نوێنەرانی ئەنجوومەنەکان کە لە شۆڕشدا بەشدار ببوون یاخود پشتیوانییان لێ کردبوو، بە زۆرینەی دەنگ کۆنترۆڵ کردنی وڵاتیان لەلایەن بەلشەفیکەکانەوە تەئید کرد. لینین ئەو تەئیدکردنەی بە رەسمی بوونی رابەریی خۆی لە قەڵەمدا



و بە رەوا زانی و ئەو کەوتە پێکهێنانی کابینەی دەوڵەت، کابینەیەك کە بە ((ئەنجوومەنی کۆمیسەرەکانی گەل)) ناوی دەرکرد. کۆمیسەرەکان هەمان وەزیرەکانی کابینەن کە لە وڵاتانی رۆژئاوادا هەن. پازدە ئەندامی کابینەکەی لینین تەنیا لە بەلشەفیکەکان هەڵبژێردران، لەوانەش لینین خۆی بە ناونیشانی سەرۆکی ئەنجوومەن، و تروتسکی کۆمیسەری کاروباری دەرەوە. لە نێوان ئەندامانی کەم بایەخی تری کابینە دەکرێ ئاماژە بۆ ((شۆڕشگێڕی گورجستانی کە کەمتر ناسراو بوو بە ناوی ژوزیف جوگاشویلی ناسراو بە ستالین یان پیاوی پۆڵایین، کۆمیسەری کاروباری گەلان))[١١] بکرێ؛ ئەمە وەسفێکە کە روبێرت دانیل کردوویەتی. کۆمیسەرەکان لەسەری سەرەوەی دەزگاکانی دەوڵەتیدابوون.



ژوزیف جوگاشویلی ناسراو بە
ژوزیف ستالین

لە سەردەمی پاشایەتی تزاردا، لینین رایگەیاند بوو و بەڵێنیدابوو بیروکراتی (کاغەز و کاغەزکاری) کە سێبەری لەسەر چالاکییە کارگێڕییەکانی رۆژانەی حکوومەت کردبوو، هەڵبگرێ. یەکێك لە یارییە فراوانەکانی رۆژگار لە مێژووی سۆڤێتدا ئەوەیە، پاش هاتنەکایەی حکوومەتی نوێی بەلشەفیکی، لینین سەرنجیدا کە پێویستی بە بیروکراتی بەربلاوتر هەیە بۆ ئەوەی بتوانێ کۆنترۆڵێکی ناوەندی بەدەستبهێنێ. ئەوانەی کە بە پێی تیۆریی مارکسیزم چاوەڕێ بوون ئەنجوومەنە ناوچەییەکانی سەربەخۆ بن. وێڕا بەو حاڵەوە، بە تەواوی نائومێد بوو. لینین بە خێرایی ئەوەی دەستنیشان کرد، کە دەبێ هێزێکی ناوەندی پێکبهێنێ. ئەو دەیگوت کە بە بێ پشتیوانی حکوومەتی ناوەندی بەڵشەفیکی، کرێکاران لە ئاستی ناوچەییدا، هەروەکو رابردوو توشی زیانمەند بوون دەبن، و بەهەر جۆرێك بێ، سەربەخۆ بوون لە پاشاندا بەکاردەبرێ. لینین لە بارەی دیموکراسییەوە قسەی کردبوو، بەڵام پاشان رایگەیاند، دەبێ وڵات خاوەنی حکوومەتێکی





ناوەندی بەهێز بێ. نموونەیەك لە میتۆدی لینین بۆ حکومەت، لە ماوەی کورتی پاش بە دەسەڵات گەیشتن و ئامادەکردنی مەیدان بۆ تۆقاندنی گشتی، ئاشکرا بوو.

پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەر، لینین داوای کردبوو کە دەوڵەتی کاتی نوێنەرانی هەموو حیزبە سیاسییەکان بانگهێشت بکا. کیرنسکی پێشکارییەکانی پێکهێنانی ئەم ئەنجوومەنەی کە پێی دەگوترا ((دامەزرێنەران)) فەراهەم کردبوو. پاش ئەوەی کە کۆنگرەی ئۆکتۆبەر رابەری لێنینی تەئید کرد، ئەو داوای کرد کە پێکهێنانی ئەنجوومەنی لەم بابەتە تا زەمەنێکی نادیار وەپاش بخەن. بەڵام تروتسکی داوای لە لینین کرد، ئەم ئەنجوومەنە بە پێی بەرنامەی پێشوو پێك بهێنرێ.

دانیل دیلر دەنووسێ: ((لە ئەنجوومەنی دامەزرێنەراندا، حیزبی بەلشەفیك لە ٧٠٧ کورسی بووە خاوەنی تەنیا ١٧٠ کورسی... ئەنجوومەنی دامەزرێنەران یەکەمجار لە ١٨ی کانوونی دووەم ساڵی ١٩١٨دا پێکهات، و دەسبەجێ لەگەڵ سیاسەتەکانی بەلشەفیکدا کەوتە ملەوە.))[١٢].

ڕۆژی پاشتر، لینین رایگەیاند، کە دەبێ ئەنجوومەنی دامەزرێنەران دابخرێ، و کۆمەڵە سەربازێکی نارده شوێنی ئەنجوومەن تا دڵنیا بێ کە هەموو نوێنەران ئەوێیان بەجێهێشتووە. لەوەو پاش ئیدی هیچ لەرێ لادانێك تەحەمول نەدەکرا. مەرامەکانی لینین ئیدی ئاشکرا ببوون: هەر جۆرە بانگەشەیەك، لەوەڕا هاتبێ کە حکوومەتی روسیا تایبەتمەندی دیموکراتیکی هەیە، بەتاڵ ببۆوە.

حیزبی فەرمانڕەوای بەلشەفیکی، کە شێوەی هەرەمی هەبوو؛ لە بنکەی هەرەمەکەدا، ئەندامانی ئاسایی حیزب نوێنەرانیان بۆ کۆنگرەی حیزب هەڵدەبژارد، کە ئەوانیش بە دەوری خۆیان کۆمیتەی ناوەندییان هەڵدەبژارد، و ئەم کۆمیتەیەش پۆلیت بورۆ {مەکتەبی سیاسی} هەڵدەبژارد. پۆلیت بورۆ لە وەزیران پێکهاتبوو کە دەزگاکانی حکوومەتیان بەڕێوەدەبرد و سەرۆکی حیزبیان هەڵدەبژارد. لینین خۆی حیزبی بنیات نابوو هەمیشەش سەرۆکی حیزب بوو. بڕیار گەلی پەسەندکراوی تایبەتی لە بارەی ماوەی دیاریکراو بۆ بە دەستەوەبوونی ئەو پلەیە بوونی نەبوو. لینین تا کاتی مردن ئەو پلەیەی بۆ خۆی پاراست. کۆنگرەی حیزب لە دەورانی دیاریکراودا پێکدەهات تا بەرنامەی دیاریکراو بۆ دەوڵەت، کە ئێستا ناوەندەکەی لە پایتەختی نوێ، موسکۆ بوو، پەسند بکا. بەڵام لەوێ را کە ئەو بەرنامەیە، و هەروەها کاندیدەکانی پۆلیت بوورۆ و کۆمیتەی ناوەندی لینینی دیاری دەکرد، تەنیا رۆڵێکی کۆنگرە ئەوە بوو کە لە هەڵبژاردنەکانی لینیندا بێ هیچ چۆن و ئەگەرێك پەنجەی رەزامەندی بەرزبکەنەوە.



گەرچی لینین فەلسەفەی سیاسی خۆی لە تیۆرییەکانی کارل مارکسەوە وەرگرتبوو کە دەیگوت شۆڕش هەنگاو بە هەنگاو حەتمەن بەرەو کۆمۆنیزم دەڕوا، ئەو نوێکارییەکی سەرەکی لەو نۆڕینانەدا دەکرد. وێڕای ئەوەش، لینین کاتی بەفیڕۆ نەدا و بە زوویی ناوی حیزبی بەلشەفیکی بۆ حیزبی کومۆنیست گۆڕی، و ئەمە نیشانەی ئەوە بوو کە حکوومەتی داهاتووی ئەو حکوومەتێکی مارکسیستی دەبێ.

## ڕێگای بەردەڵانی سۆسیالیزم

### پیشەسازی و کشتوکاڵ

کاری گەورەی میللی کردنی پیشەسازییەکانی روسیا شتێك نەبوو لە شەوێکدا بتوانرێ ئەنجام بدرێ. بەو پێیە لینین قۆناغ بە قۆناغ لە جادەی سۆسیالیزمدا هەنگاوی نا. ئەو لە گۆڕینی موڵکدارێتی تاکەکەسییەوە بۆ موڵکدارێتی دەوڵەتی، کۆمەڵە هەنگاوێکی بەرەو یەکسانی چینەکان هەڵگرت و بەهای بە یەکسانی خوازی ئابووری و کۆمەڵایەتی بەخشی. بۆ نموونە لە یەکێك لە راگەیەنراوەکانیدا هەموو ناونیشانەکان ودابەشبوونەکانی یاسای چینایەتی هەڵگرت. لە هەمان کاتدا، ئەم دەستپێشکەرییە ئامانجێکی دیکەی هەبوو کە زیادکردنی بەرهەم بوو، ئەو ئامانجەی بە جۆرێکی تەواو نەهاتە دی. کرێکارانیش لە ئاکامی کارەساتەکانی



**جووتیاران لە یەکێك لە بازاڕەکانی روسیا سەرگەرمی کڕین و فرۆشتنی کاڵان.**

جەنگی یەکەمی جیهانی و هەروەها بە هۆکاری یەك ساڵ ناکۆکی و کێشەوبەرەی ناوخۆیی لەسەر دەسەڵات بە تەواوی شەکەت و گیرخواردوو ببوون.

جووتیارانیش کە هێشتا بە کۆڵەگەی کشتوکاڵی روسیا دەژمێردران، هەمان حاڵەتیان هەبوو و لینین بەو دەرەنجامە گەیشت، کە دەبێ مژدەی ژیانێکی باشتر لەداهاتوودا بەوان بدرێ. بەو پێیە ئەو جارێکی دیکەش بەڵێنی زەوی بەواندایەوە و مۆڵەتیدا ئەوان لە فرۆشتنی بەروبوومی خۆیان تا رادەیەك ئازاد بن. ئەم بریارانە لەگەڵ فەلسەفەی مارکسیستیدا جیاوازییان هەبوو. بەڵام لینین بەردەوام رەچاوی بەرژەوەندی دەکرد: میللی کردنی پیشەسازی و کشتوکاڵ، کرێکاران و جووتیارانی بەوەفای بەرەو پشتیوانی حکوومەتی نوێ و هاوکاری کردن نەبرد؛ ئەوەبوو لینین هەنگاوێکی بۆ دواوە هاویشتەوە، و رەوشی سۆسیالیست کردنی تەواوەتی وەپاشخست. بەڵام بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێکی دیکەی بەلشەفیکی، ئەم پاشەکشێیە لە بنەماکانی کومۆنیستی کارێکی پێویست بوو. ئامانجی ناوبراو بریتی بوو لە نوێکردنەوەی دامەزراوەی سوپا.

## نوێکردنەوەی دامەزراوەی سوپا و پێکهاتنی ئەنجوومەنەکان

لینین لە رام کردنی سوپادا، کارێکی کە کیرنسکی تێیدا شکستی هێنا، سەرکەوتنی بەدەستهێنا: لەم کارەدا ئەو پەنای بردە بەر هۆشیاری چینایەتی سەربازانی ئاسایی، ئەو سەربازانەی کە لە جەنگدا نائومێد ببوون و پاش تێکشکانیان لەگەڵ ئەڵمانەکاندا ئامادەبوون بیروباوەڕی خۆیان بگۆڕن. زۆرێك لە ئەفسەران بە جۆرێکی بێ ئەملاو ئەولا بەو بەڵگەیە پشتیوانییان لە حکوومەتی نوێی بەلشەفیکی دەکرد جا بەهەر حاڵێك بێ، ئەو حکوومەتێکە، و بەو پێودانگە وا دەهاتە بەرچاو کە لە باری درێژەکێشانی کارەکەیانەوە، خەیاڵی ئەوان ئاسوودە دەکا.

لینین لە کانوونی دووەمی ١٩١٨ بە پێی بنەماکانی سۆسیالیستی رێکخستنی سوپای نوێکردەوە و ناوی سوپای سووری لێنا. ریچارد پایپس لە روونکردنەوەی ئەم بابەتەدا دەڵێ:

((بەلشەفیکەکان تەنانەت پاش بەدەستهێنانی دەسەڵاتیش، درێژەیان بەسووککردن و کەمکردنەوەی ئەوەشدا کە لە سوپای کۆن مابۆوە، و ئەفسەرانیان لەو دەسەڵاتە ناچیزەش بێبەش کرد کە هێشتا بۆیان مابۆوە. سەرەتا فەرمانیان دەرکرد کە ئەفسەران هەڵبژێردرێن، و



پاش ئەوە زنجیرەی پلە سەربازییەکانیان هەڵگرت، و دەسەڵاتی فەرماندەییان بە ئەنجوومەنی سەربازان سپارد.))[١٣].

ئەم کار پێکهێنانە تا رادەیەك وەبیرهێنانەوەی((فەرمانی ژمارەی یەك)) بوو، کە مۆڵەتی بە سەربازان دەدا ئەفسەرانی سەرووی خۆیان هەڵبژێرن. بەڵام ئەم رەوتە کاربڕێنەوە نەبوو، چونکە لەگەڵ دیسپلینی بنەڕەتیی سوپادا نالێك بوو. ئەم فەرمانەش، هەروەکو بەڵێنی لینین لە بارەی بێلایەن بوون لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا، بەو هۆکارەوە دەرچوو، کە ئەو پشتیوانی پلەکانی خوارەوە لە سوپادا بەدەستبهێنێ.

زەمانێك لینین کونترۆڵ کردنی سوپای بەدەستهێنا، سەرنجی خۆی خستە سەر ئەنجوومەنە ناوچەییەکان لە سەرتاسەری وڵاتدا. سەپاندنی دیسپلینی پتەوی حیزبیی بەسەر ئەو ئەنجوومەنە جۆر بە جۆرانەوە، سەختتر بوو.دانیل دیلر بەم شێوەیە میتودی لینین راڤە دەکا((لەوەی کە بەلشەفیکەکان لە زۆر لە ئەنجوومەنەکانی شارو لادێدا بە جۆرێکی شایان نەناسرا بوون، {کارگوزارانی لینین} پەنایان بۆ تاکتیك گەلێکی جۆر بەجۆر برد، هەر لە ململانێی سیاسییەوە بیگرە تا هەڕەشەو تۆقاندن و بەکارهێنانی هێزی چەکدار.))[١٤] لە کۆتایی ساڵی ١٩١٨دا حکوومەتی نوێی بەلشەفیکی بە جۆرێکی پەیگیرانە کونترۆڵی زۆربەی ناوچەکانی وڵاتی بە دەستەوە بوو. ئەم کارە تا رادەیەك قەرزاری تاکتیکەکانی تیرۆر (تۆقاندن)ی لینین بوو، ئەو تاکتیکانە وەکو نموونەیەکی هەراسانهێن لە بێبەزەیی حکوومەت، مانەوە.

## تیرۆری سوور

هەرکە لینین گەیشتە دەسەڵات، بە پەلە کەوتە سەر مەحکەم کردنی ئەو دەسەڵاتە. ستراتیژی ئەو، ئەوەبوو سیاسەتی تەحەمول نەکردن بەرامبەر سەرپێچی و لادان لە فەرمانەکانی خۆی، پیادە بکا. یەکێك لە یەکەمین دەستپێشکەرییەکانی لەو بەستێنەدا دامەزراندنی دەزگای ((چیکا)) بوو، کە جۆرە دەزگایەکی پۆلیسی نهێنی بوو، وەزیفەی ئەم دەزگایە، گەڕان و دۆزینەوە و کوشتنی ئەو کەسانە بوو کە لینین ئەوانی بە ناونیشانی ((دوژمنانی گەل))وە ناساند. جگە لە لەسێدارە دیاریکراوەکان، کارگوزارانی چیکا زۆرجار کەسانی بێتاوانیان گوللە باران دەکرد تا کەش و هەوای تۆقاندن پتر پەرە پێ بدەن. ریچارد پایپس بیانوو هێنانەوەی لینین بۆ ئەوە کە لە پاشاندا بە تیرۆری سوور ناوبانگی دەرکرد بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە ((کامیان باشترە- دەیان یان سەدان کەسی ئاژاوەگێڕ، بێ گوناە یان





گوناهبار، بەئاگا یان بێئاگا، بخەینە نێو زیندانەوە، یان هەزاران کەس لە سەربازانی سوپای سوور و کرێکاران لە دەست بدەین؟ یەکەمیان باشترە.))[١٥]

لۆژیکی لینین ئەوەبوو کە بەرپاکردنی کەش و هەوای تۆقاندن و زراوبردن، ببێتە بەربەستی نارەزایەتی دژی دەوڵەت. لەوەش بەولاوە بە هەمان مەرام، لینین بچووکترین ڕاڕاییی نەدەهێشتەوە لەوەی، کە بەڵێن گەلێك ڕابگەیەنێ، هەر لە بنەڕەتدا مەبەستی نەبوو بیانخاتە واری جێبەجێ کردنەوە.

لینین پێش ئەوەی بگاتە دەسەلات، بۆ ئەوەی خەڵك بکاتە لایەنگری بە دەسەلات گەیشتنی حیزبی بەلشەفیك، بەڵێنگەلێکی دڵهەژێنی زۆریدا، جگە لە چاکسازیی زەوی وزار، ئازادی چاپەمەنی زامن کردبوو، و هەروەها قبوولّ کردنی حیزبگەلی نارازی، و دواجاریش سەلماندنی ئۆتۆنۆمی بەکۆمارەکانی غەیرە ڕوسی، وەکو ئۆکراین، کە لەژێر ئیمپراتۆریای ڕوسیدا بوون. هەموو ئەو بەڵێنانە تەنیا لە ئاستی قسەدا مانەوە. گەرچی لە ساڵی ١٩٢٠ ئۆکراین، بیلاڕوسیا، ئەرمەنستان، ئازەربایجان و گورجستان بە ((کۆمارەکانی سۆسیالیستی سۆڤێت) ناوبران، بەلام ئەوانە کۆماری سەربەخۆ نەبوون کە خۆیان کاروباری خۆیان بەڕێوە ببەن. لە ڕاستیدا، بە هەمان ئەندازەی کە حکومەتی ناوەندی بە تێپەڕبوونی کات بە هێزتر دەبوو، ئەم دەوڵەتە پلە دوانەش سەربەخۆیی خۆیان لە دەست دەدا. لینین نەهەر تەنیا ناپاکی بەرامبەر ئەو بە ناو کۆمارانە کرد، بەڵکو ئەو بڕە ئازادییەش کە هاوڵاتیانی سۆڤێت هەیانبوو، لەوانی ستاندەوە.

## کۆنترۆڵ کردنێکی توندی کۆمەڵگای ڕوسی

تیرۆری سوور تەنیا ئازار و هەراسان کردنی دوژمنانی حکومەتی تازەی سۆڤێتی نەدەگرتەوە. ئەم تیرۆرە گۆڕینی کۆمەڵگاشی گرتبووە خۆی. گەرچی حکومەتی تزاری بە حکومەتێکی سەرەڕۆ دەژمێردرا، بەلام بە جۆرێکی نارەسمی پاژێك لە چالاکییەکانی یەکێتییەکانی کرێکاران، ئەنجوومەنەکان و حیزبە شۆڕشگێڕەکانی وەکو حیزبی بەلشەفیکی، کە هۆکارو بنیاتنەری ژێرەوژوورکردنی هەمان ڕژێم بوو، قبوولّ دەکرد. لینین ئەو هەڵەیەی دووبارە نەکردەوە. ئەگەر کەسێك ئاسایشی نەتەوەیی بخستایە بەر هەڕەشەوە (هەمان ئەو کارەی کە لینین لە بەرەوپێش بردنی شۆڕشدا کردبووی) مافی ئەوەی نەبوو وڵات بەجێ بێڵێ (هەمان کار کە لینین لە کاتێکدا کە چالاکییەکانی ئەو دژ بە تزار بەرپرسانی بەرامبەر خۆی ڕەشبین دەکرد، چەندین جار دووبارەی کردبۆوە).



لە ڕژێمی نوێی کۆمۆنیستیدا، نارازییان دەستگیردەکران، و ئەوانەی بە دژە شۆڕشی مەترسیدار دەهاتنە بەرچاو، لە سێدارە دەدران. سەرکوتکارییەکانی لینین لە سەردەمی تیرۆری سووردا، جگە لە دەستگیرکردنی بێ بەڵگە، ئەم ڕەهەندانەشی دەگرتە خۆی: قەدەغەکردنی ئازادی ڕادەربڕین، سەرکوتکردنی یەکێتییەکانی کرێکاران، و دواجاریش مەیدان ئاوەڵاکردن بۆ جاسووسان.

روسیا

لە ڕاستیدا لینین لەم جۆرە دەست پێشکەرییانەدا ئەوەندە بەرەوپێش چوو کە قانوونی هەڵوەشاندەوە و لە جیاتی ئەو شتێکی دانا، پێی دەگوت ((ویژدانی شۆڕشگێڕی)) بەپێی ڕوانینی پایپس، بەرپرسانی شۆڕشگێڕی ((هەر کەسێکیان خۆشنەویستبایە لە نێویان دەبردو {لە ژێر ناوی ویژدانی شۆڕشگێڕی}دا دەستیاندابووە ڕەشەکوژییەکی بەرنامەرێژکراوی نارازییەکانی خۆیان.))[١٦]

بەو حاڵەوە، سەرەڕای بێ بەڵێنی تەواوی لینین، پاش تیرۆری سوور کەوتە بەرچاو، بەڵێنێك کە لینین حەزی دەکرد پێی وەفادار بێ: بێلایەنبوون لە جەنگی یەکەمی جیهانی بوو.

## ڕوسیا له جەنگی یەكەمی جیهانی پەناگیری دەكا

بۆ ئەوەی روسیا خـۆی لـە جـەنگ بكێـشێتەوە، پەیماننامـەیێكی شـەرمەزارانەی لەگـەڵ ئەڵمانیادا مۆركرد كە لە بەرواری ٣ی مارتی ١٩١٨دا لە شاری (برست لیتوڤـسك)ی پۆڵۆنیـا بەسترا. زۆربەی بەلشەفیكەكان لە پشتی پەردەوە بەربەرەكانی ئـەم پەیماننامـەیان كـرد. بـەڵام لینین، ئەو رابەرە واقیعگەرایە، ئەو پەیماننامەی قبـووڵ كـردو سـەرەنجام بەسـەریاندا زاڵبـوو، رۆبێرت دانیل لەمبارەیەوە دەنووسێ: ((ڕوسیا ناچـار بـوو، كـونترۆڵی پۆڵۆنیـا، كـە ئـەڵمانیا داگیری كربوو، و هەروەها وڵاتانی دیكەی سەر حەوزی باڵتیـك بـەو وڵاتـە بـسپێرێ... ئەمـە بەدترین پاشەكشێی روسیا بوو لە قەڵەمڕەوی خۆی، شكستێك بوو كە نێزیك بە چواردە سـەدە بوو پێشینەی نەبوو.))(١٧) سەرباری ئەوەش، پاشەكشێ كردن دەرفەتی بۆ لینین رەخـساند تـا سەرنجی خۆی بۆ تێكشكاندنی ناڕازییان لە حكوومەتی بەلـشەفیك كـە رۆژ بـە رۆژ رووبـەزیاد بوون بوون، چڕبكاتەوە. جیاوازی بیروباوەڕ، كە پاشەكشێ لە جـەنگ ئـاگری ئـەم جیاوازییـەی خۆشتر دەكرد، ئەوەندە هێزی تێـدا بـوو، ببێتـە هۆكـاری هەڵاسـیاندنی جـەنگێكی نـاوخۆیی خوێناوی.



**لە ماوەی تیرۆری سووری لینین دا بەكرێگیراوانی دەزگای چیكا بەزۆری خەڵكی بێ تاوانیان گوللەباران دەكرد تا پەرە بەكەش و هەوای تۆقاندن و نەترەچوون بدەن.**



## جەنگی ناوخۆیی

دەتوانرێ تا رادەیەك جەنگی ناوخۆیی بە جوولانەوەیەك دژی شـۆڕش بـژمێردرێ. هەرچـەندە بەلشەفیكەكان لەو سەردەمەدا كونترۆڵی وڵاتیان لە دەستدابوو، زۆرێـك لـە روسـەكان پـشتیوانی شـۆڕش بـوون مانـای شۆڕشـی ١٩١٧ كـە دەوڵـەتی كـاتی هێنـابووە سـەركار- بـە تونـدی بەربەرەكانییان لەگەڵ حكوومەتی بەلشەفیكەكاندا دەكرد و بەتایبەتی لە پەناگیرەوەستانی لینین لە جەنگی یەكەمی جیهانی بە توندی رقیانداگرتبوو. ئەم ناڕازییانە كە بە ((سپییەكان)) دەناسـران، هاوكارییان لە پاشماوەكانی هاوپەیمانانی جەنگ بە تایبەتی بریتانیا و ئەمریكا وەردەگرت.

بەڵام ئانێك كە جەنگی یەكەمی جیهانی بە پەیمانی ڤێرسای لە ساڵی ١٩١٩ كۆتـایی هـات، ئارەزووی هاوپەیمانان بۆ پشتیوانی كردنی ((سپییەكان)) كاڵ بـۆوە و دووبـارە بـەخت بـووەوە بـە یـاری سـوورەكان. جـەنگی نـاوخۆیی لـە سـەرەتاكانی سـاڵی ١٩٢٠ لـە بەشـی ئـەوروپای روسیادادامركایەوە، و ئەو ساڵە كۆتایی داگیركردنی ئەمریكییەكان بوو لە پاش جەنگ.

سـەرەنجام لیـنین هـەلی هاتەدەسـت تـا وڵاتـی نـوێی بنیـات بنـێ: یـەكێتی كۆمـارە سۆسیالیستییەكانی سۆڤێت. بە زمانێكی سادەتر یەكێتیی سـۆڤێت. ئـەم (كۆمـارە) لـە سـاڵی ١٩٢٩دا توركمەنستان، ئۆزبەكستان، تاجیكستان، ئۆكراین و كۆمارەكانی دیكە بوون كە پێـشتر پێیەوە پەیوەست ببوون. بەڵام لینین بۆ تەواوكردنی كارەكەی خۆی لە زەمینەی هێنانـەدی وڵاتـی سۆسیالیستی، پێویستی بەوە بوو كە تاكتیكی تیرۆركردنەكانی تەواو بكا.

ئەو لە حاڵێكدا كە تیرۆری سووری بۆ لادانـی ناڕازییـانی خـۆی و ناڕازییـانی بـە دەسـەڵات گەرایی خۆی بەكاربردوو، ئێستا دەیویست شتێك كە بە ((كومۆنیـستی جـەنگیی)) نـاوی دەبـرد بخاتە مەیدانـەوە، تـاكو بـە پەلـە كۆمـەڵگای روسـیا بـۆ سیـستەمێك بگـۆڕێ كـە ئـابووری و سیاسەتەكەی لەگەڵ بنەماو بنەڕەتەكانی كۆمۆنیزمدا هاوئاهەنگ بێتەوە.

*ڕێنوێنی لینین بۆ ئاشتی لەگەڵ ئەڵمانیا*

*پێشنیاری لینین كە لەسەر بنەمای پەناگیری لە جەنگی دووەمی جیهانی و ئاشـتی جودایانـە لەگـەڵ ئەڵمانی بنیاتنرابوو، بە توندی كەوتە بەر نارەزایی زۆرتری رابـەرانی بەلـشەفیكەوە. بـە بـاوەڕی ئـەوان، كۆمۆنیزم لە روسیا تەنیا كاتێك دەیتوانی درێژە بكێـشێ كـە شۆڕشـی جیهـانی لـە ئـەوروپای رۆژئـاوا بـەرپابێ. ئـەو رابەرانـە لـەوە دەترسـان، ئاشـتی لەگـەڵ ئـەڵمانیای سـەرمایەداری شـۆڕش دەخاتـە مەترسییەوە. ریچارد پایپس لە كتێبی شۆڕشی روسیا، نۆڕینی لینین لەو زەمینەیەدا دەگێڕێتەوە:*

*لینین ئامادەبوو لە ژێر باری هەر هەلومەرجێکدا پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ هێزەکانی میحوەر {ئەڵمانیا} دا ئیمزا بکا، بەڵام بەو مەرجەی، ئەوان کاریان بەسەر پێگەی دەسەڵاتی ئەوەوە نەبێ. ئەو بەرهەڵستییە کە لینین لە ئەندامانی حیزبەکەی خۆی بینی، لەو باوەڕەوە سەرچاوەی دەگرت کە حکوومەتی بەلشەفیکی تەنیا کاتێك دەتوانێ بەردەوام بێ کە شۆڕشێك لە ئەورووپای رۆژئاوا رووبدا (لینین بۆ خۆشی باوەڕی بەو روانینە هەبوو)، و هەروەها لەو باوەڕەشەوە دەهات کە شۆڕشێکی ئاوا لەوانەیە لەهەر ئانێکدا رووبدات (لینین بە تەواوی ئەم باوەڕەی قبووڵ نەبوو).*

*بایەخی لینین بە پلەی یەکەم لەسەر مانەوەی وەختیی و دەست بەجێیی حکوومەتەکەی گیرسابۆوە. لینین بەم شێوەیە بەڵگەی دەهێنایەوە: ((تاکتیکەکانی ئێمە دەبێ... {لەسەر ئەو پرەنسیپە} دامەزراو بێ کە چۆن بە شێوەیەکی هەرچی شیاوتر و ئومێدەوارتر ئەو دەرەتانە فەراهەم بکەین کە شۆڕشی سۆسیالیستی لە وڵاتێکدا جێ پێی خۆی قایم بکا، یان بتوانێ درێژە بە مانەوەی خۆی بدا، تا رۆژێك هەموو وڵاتان بە ئێمەوە پەیوەست دەبن)).*

## کۆمۆنیزمی جەنگیی

((کۆمۆنیزمی جەنگیی)) دروشمێك بوو، ئاماژەی بۆ زەمینە خۆشکردنێك دەکرد کە لینین لە رێگای پیادەکردنییەوە کۆمەڵگای کۆنینەی روسیا لە زەرفی ماوەیەکی کورتدا بە جۆرێك لە سیستەمی ئابووری کۆمۆنیستی بگۆڕێ. بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی ئاوا، لینین لەو باوەڕەدابوو، لە سەرەتادا دەبێ موڵکداریێتی تایبەتی و بازاڕەکانی کڕین و فرۆشتنی کاڵاکان هەڵبووەشێنێتەوە. دەوڵەت خۆی کردە خاوەنی هەموو بانکەکان و پیشەسازییەکان. ئێستا تەواوی جووتیاران، کرێکاران و کارگوزاران کاریان بۆ دەوڵەت دەکرد.

لەوێ را ئێستا هەموو بەروبوومەکان بە دەوڵەتەوە پەیوەست بوون، دەوڵەت بە ناوی سۆسیالیستی کردنی بەشی سەرەکی زەوی و زارەوە ببووە خاوەنی، کارگوزارانی دەوڵەت، مۆڵەتیان پێبوو کە بەروبوومەکان زەوت بکەن و کرێیەکی کەم بدەنە جووتیاران. جووتیاران وەك نیشانەی ناڕەزایی بەرهەمێکی کەمتریان دێنایە بەرهەم و تا ئەو جێیەش، دەیانتوانی پشکێکیان بۆ خۆیان هەڵدەگرت و دەیان شاردەوە. ئەم کارکەمی و پاوانکارییە، وێڕای وشکە ساڵی دووردرێژ، کەمبوونێکی توندی لە خواردەمەنی هێنایە کایەوە، لە سەرەتای دەیەی ١٩٢٠دا نزیکەی پێنج ملیۆن کەسی لە نێوبرد. بە ئاشکرا دەرکەوت کۆمۆنیزمی جەنگیی کاربڕێنەوە نییە.



### شۆڕشی کرونشتات

*شۆڕشێك کە لە ساڵی* **1921** *لە پایەگای دەریایی کرونشتات روویدا، لە توانایدا بوو لینین والێبکا کە کۆمۆنیزمی جەنگیی بخاتە لاوە. مەلەوانانی ئەم پایەگایە کە بە دەست نەبوونی و برسێتی و هەروەها شوێنەوارەکانی کۆمۆنیزمی جەنگیی لە ئازاردا بوون، لە بەیاننامەیەکدا داوایان کرد حکوومەتی نوێ بەڵێنەکانی خۆی لە بارەی دانی دەسەڵات و ئۆتۆنۆمی بە خەڵك پیادە بکا. وەزیرانی حکوومەت دەیانزانی بۆ پاراستنی دەسەڵاتی خۆیان، پێویستە ئەم شۆڕشە بە توندی سەرکوت بکەن. ئەوان ئەو کارەیان لە رێگای کوشتنی هەزاران کەس لە مەلەوانانی کرونشتات ئەنجامدا. روبیرت پین بیۆگرافی نووس لە کتێبەکەیدا بە ناوی ژیان و مردنی لینین ئەو رووداوە بەو شێوەیە راڤە دەکا:*

*مەلەوانانی کرونشتات پیاوانێکی ئازابوون، بەڵام شۆڕشگێڕی بێ توانا بوون. ئەوان لە ناخی دڵەوە باوەڕیان بە دروشمی ئاشتیخوازانەی خۆیان هەبوو. هەر دەتگوت بەدەست نەخۆشییەکی نەناسراوەوە ئازاریان دەچێشت: پێکهاتەیەك لە ئومێدەواری و بیری باش، و ئەوان وایان وێنادەکرد، دەتوانن ئەم نەخۆشییە بڵاوبکەنەوەو هەموو خەڵکی روسیا دووچاری ئەم دەردە بکەن. ئەو پرسە کە لینین مرۆڤێکە دڵڕەقە و بێبەزەیی بە دڵی ئەواندا رانەبووری مەگەر بە درەنگ وەختەوە، ئەوان نەیاندەزانی ئەو حوکمی لە سێدارەدانی مەلەوانانی کرونشتات بە هەمان بێباکی و ئاسانییەوە ئیمزا دەکا کە بۆرژوازی دەیکا.*

کۆمۆنیزمی جەنگیی بە هەڵگرتنی سیستەمی ئاسایی بازرگانی و لاوازکردنی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی، گورزێکی توندی لەو سیستەمە سرەواند. بەڵام هەمان سیستەمی ساتمەخواردوو، زۆرانکەسی لەو مردنە رزگار کرد کە لە ئاکامی برسێتی سەری هەڵدابوو، و ئەمەش لە بنەڕەتدا لەو رووەوە بوو کە هەڵوەشانەوەی لە ناکاوی شێوازەکانی باوی بازرگانی، بەرپرسانی ناچارکرد شێوەیەکی دیکەی ئابووری لە جێگەی ئەودا دامەزرێنن. خاوەنداریێتی کردنی بێبەزەییانەی بەرهەم بۆ حکوومەت، بووە باسی هاتنەکایەی جۆرە رژێمێکی بازرگانی ژێرزەمینی، کە بە بازاڕی رەش ناودەبرێ، رژێمێك کە تا ئەمڕۆکەش هەر لە کاردایە. ریچارد پایپس ئەو خاڵە پشت راست دەکاتەوە کە ئەوانەی بەرپرسیاری پیادەکردنی کۆمۆنیزمی جەنگیی بوون، درکیان بە رۆڵی بازاڕی رەش کردبوو: ((پیادەکردنی وردی {کۆمۆنیزمی جەنگیی} تەنانەت ئەگەر لە کردن هاتووش بوایە، دەبووە بایسی کارەساتێکی ئابووری. بەرپرسانی کۆمۆنیست گەیشتبوونە ئەو بەرەنجامە، کە بێ بازرگانی قاچاغی کەرەسەی خواردەمەنی کە دوو لە سێی نانی شارنشینانی دابین دەکرد، خەڵکانی شار لە برساندا دەمردن.))[١٨].

پێویست بوو لینین ستراتیژێکی نوێ بۆ سەپاندنی کۆمۆنیزم بەسەر یەکێتیی سۆڤێتدا، بدۆزێتەوە. لەوەوپاش لینین رووی کردە ((سیاسەتی نوێی ئابووری))





## سیاسەتی نوێی ئابووری

لە ساڵی ١٩٢١ بەرنامەی لینین بۆ چاکسازیی لە جووڵە کەوتنی ئابووری، کە لـە ئاکـامی کۆمۆنیزمی جەنگیی هاتبووە ئارا، دووبارە گێڕانەوەی شـێوەیەکی بەرتەسـکی سـەرمایەداری بوو، ئەو شتەی کە خۆی ناوی لێ نا سیاسەتی نوێی ئابووری (نپ). ئەو ئەم پاشەکشێ کردنەی لە سۆسیالیزم بەکارێکی کاتیی دانا. ڕۆبیرت پین لەم بەستێنەدا ئاوا دەنووسێ:

((سیاسەتی نوێی ئابووری جۆرێك پەناگیری بوو لە تیـۆریی کۆمـۆنیزم، کۆمۆنیزمێـك کـە لینین شیکردبۆوە... لینین دەیزانی بەم کارە ڕێگایەك بۆ سەرمایەدارییەکی میانڕۆ دەکاتەوە... جووتیاران مۆڵەتیان هەبوو زیادەی دانەوێڵەکانی خۆیان لە بازاڕی ئازاددا بفرۆشن. فرۆشـتن بـۆ بەدەستهێنانی قازانج، کە پێشتر بە تاوانێکی دژ بە دەوڵەت دەژمێردرا، ئێستا بە ڕەسمی هـان دەدرا.))[١٩]

بەڵام تاکە هۆکاری سەرهەڵدانی قاتوقڕی لە ساڵی ١٩٢١ ناڕێکوپێکی ئابووری بوو. وشکە ساڵیی، گەردەلولی لم و هێرشی کولله، زۆر لە جووتیارانی ناچارکرد مـەزراکانی خۆیـان بـەجێ بێڵن و پەنا بۆ شارەکان، ئەو شارانەی کە بێ کۆمەگ وەرگرتن لە دەرەوەی وڵات، نەیاندەتوانی نەخواردن بەوان بدەن و نە ئەنوایەك، بۆ ئەوان دابین بکەن.

هربرت هیفر، سەرۆك کۆماری داهاتووی ئەمریکا کە لـەو سـەردەمەدا سـەرۆکی دەزگـای بەهاناچوونی ئەمریکا بوو، لـە لایـەن لینینـەوە مۆڵـەتی دەسـت کـەوت تـا لەدابەشـکردنی خواردەمەنی بەسەر خەڵکی برسیدا، دەستبەکاربێ، و لەو ڕێگایـەوە لـە کۆمـەکی کرێکـارانی ڕوسیا بەهرەمەند ببێت. بە پێی نووسینی پین: ((نزیك بە نیوەی ئەو ڕوسانەی کە لـە دەزگـای بەهاناچوونی ئەمریکا لەو بەستێنەدا خزمەتیان کردبوو پاشان دەستگیرکران. بەو بەڵگەیـە کـە {وا وێنا دەکرا} پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکاییەکان، بـە شـێوەیەکی بـەدەر لـە دەبـێ و نابـێ، ئەوانی کردووە بە کەسانێکی دژە شۆڕش.))[٢٠] هاوکارییەکانی ئـەمریکا ئەوپـەڕی پێویـستی پێویست بوون و زۆران کەسی لە مردن ڕزگار کرد، بەڵام سیاسەتی نوێی ئابووری (نپ) بوو کـە پێشی بە رووخانی حەتمی ئابووری دەگرت.

بۆ لینین کارێکی نەگونجاو بوو، ناچاربێ سیستەمی تەواوی سۆسیالیستی هـەرئاوا وەپـاش بخا. بەڵام سیاسەتی نوێی ئابووری بە باشی کاربڕێنەوە بوو. هەڵسەنگاندنی دیلـر لەمبابەتـەدا بـەو شـێوەیەیە: ((سیاسـەتی نـوێی ئـابووری لـە ڕێکوپێـك کردنـی هەلومـەرجی وڵات و نوێکردنەوەی ژیانی ئابووریدا، سەرکەوتوو بوو. لـە سـاڵی ١٩٢٨ بەرهـەمهێنان لـە زۆربـەی لقەکانی پیشەسازیدا زیاد بوو و گەیشتبووە ئاستی قۆناغی پێش جـەنگی یەکـەمی جیهـانی. ئەم نوێکردنەوەیە لەگەڵ زیادبوونی خۆشگوزەرانی جووتیاران و خـاوەن پیـشەی بـچووکدا وێـرا بوون))[٢١]. سیاسەتی نوێی ئابووری یەکێك لە دەستکەوتە کەمە ئەرێتییەکانی قۆناغی تەمەن کورتی ڕابەرایەتی لینین لە یەکێتیی سۆڤێت بوو.

## میراتی لینین

زۆربەی توانای لینین وەکو کەسێکی شۆڕشگێر، بـۆ بەدەسـتهێنانی دەسـەڵات و پاراسـتنی دەسەڵات تەرخان دەبوو. ئەو سیاسەتوانێك بوو هەم کارکردەو بەرژەوەندبین و هەم هەلپەرسـت، کە ئارەزووی دەکـرد لـە ڕێگـای گەیـشتن بـە کۆمـەڵگای کۆمۆنیـستی، چاوپۆشـی لـە هـەر پرەنسیپێك بکا. سەیر لەوەدا بوو، پاشەکشێیەکانی جار بەدوای جاری لیـنین لـە مارکـسیزمی کلاسیك ببووە بایسی پاراستنی ڕابەرایەتی ئەو و دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکان.

نموونەیەك لە بارەی کارکردەیی و بەرژەوەندبینی لینین هەمان سیاسەتی نـوێی ئـابووری بوو کە بە مانای پاشەکشێ کردن لـە سۆسیالیـست سـازیی دەژمێـردرا. بـەو پێیـە بـوو، ڕەفتاری بێبەزەییانەی لەگەڵ کۆمارەکانی غەیرە ڕوسی لە یەکێتیی سۆڤێت وەکو ئـۆکراین کە لینین بەر لەوەی دەستی بەسەر دەسەڵاتدا گیر ببێ، ئەم جۆرە کۆمارانەی بـە کۆلۆنیالـە چەوساوەکانی ئیمپراتۆری ڕوسیا ناودەبرد و بەڵێنی ئۆتۆنۆمی پـێ دەدان. بـەڵام هـەر کـە گەیشتە دەسەڵات، بێبەزەییانە هەمـوو کوۆششەکانی ئەم کۆمارانەی بۆ چـوونە دەرەوە لـە یەکێتیی سۆڤێت سەرکوت کرد.







*رێنوێنی لینین بۆ ئاشتی لەگەڵ ئەڵمانیا*

*پێشنیاری لینین کە لەسەر بنەمای پەناگیری لە جەنگی دووەمی جیهانی و ئاشتی جودایانە لەگەڵ ئەڵمانی بنیاتنرابوو، بە توندی کەوتە بەر ناڕەزایی زۆرتری رابەرانی بەلشەفیکەوە. بە باوەڕی ئەوان، کۆمۆنیزم لە روسیا تەنیا کاتێك دەیتوانی درێژە بکێشێ کە شۆڕشی جیهانی لە ئەورووپای رۆژئاوا بەرپابێ. ئەو رابەرانە لەوە دەترسان، ئاشتی لەگەڵ ئەڵمانیای سەرمایەداری شۆڕش دەخاتە مەترسییەوە. ریچارد پایپس لە کتێبی شۆڕشی روسیا، نۆڕینی لینین لەو زەمینەیەدا دەگێڕێتەوە:*

*لینین ئامادەبوو لە ژێر باری هەر هەلومەرجێکدا پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ هێزەکانی میحوەر {ئەڵمانیا} دا ئیمزا بکا، بەڵام بەو مەرجەی، ئەوان کاریان بەسەر پێگەی دەسەڵاتی ئەوەوە نەبێ. ئەو بەرهەڵستییە کە لینین لە ئەندامانی حیزبەکەی خۆی بینی، لەو باوەڕەوە سەرچاوەی دەگرت کە حکوومەتی بەلشەفیکی تەنیا کاتێك دەتوانێ بەردەوام بێ کە شۆڕشێك لە ئەورووپای رۆژئاوا رووبدا (لینین بۆ خۆشی باوەڕی بەو روانینە هەبوو)، و هەروەها لەو باوەڕەشەوە دەهات کە شۆڕشێکی ئاوا لەوانەیە لەهەر ئانێکدا رووبدات (لینین بە تەواوی ئەم باوەڕەی قبووڵ نەبوو).*

*بایەخی لینین بە پلەی یەکەم لەسەر مانەوەی وەختیی و دەست بەجێیی حکوومەتەکەی گیرسابۆوە. لینین بەم شێوەیە بەڵگەی دەهێنایەوە: ((تاکتیکەکانی ئێمە دەبێ... {لەسەر ئەو پرەنسیپە} دامەزراو بێ کە چۆن بە شێوەیەکی هەرچی شیاوتر و ئومێدەوارتر ئەو دەرەتانە فەراهەم بکەین کە شۆڕشی سۆسیالیستی لە وڵاتێکدا جێ پێی خۆی قایم بکا، یان بتوانێ درێژە بە مانەوەی خۆی بدا، تا رۆژێك هەموو وڵاتان بە ئێمەوە پەیوەست دەبن)).*

لە پرۆسەی دامەزراندنی یەکەمین حکوومەتی مارکسیستیدا، لینین، نموونەیەکی لە حکوومەتی زۆردارانە هێنایەکایەوە کە فەرمانڕەوایانی داهاتووی سۆڤیێت پەیڕەوییان لێ کرد. ئەگەر سەرکردایەتی روسیا لە کاتی ساڵانی یەکەمی شۆڕشدا رەچاوی مافەکانی مرۆڤیان بکردبایە و ئازادی ئابوورییان بدابایە بەوان، لەوانەبوو نەتوانن لە بەرامبەر بەربەرەکانی نەیارانی خۆیاندا، کە ئەوان ئامادە بوون لە پێناوی بەدەستهێنانی ئەنجامی ساتەوەختدا، مافەکانی خەڵك بکەنە قوربانی، درێژە بە مانەوەی خۆیان بدەن. مسۆگەر لینین لە دەستەی دووەم بوو، مانای بۆ مانەوەی خۆی لەم زەمینەیەدا هیچ هەڵێکی لەدەستنەدەدا.

ئەو لە جیاتی ئەوەی، ئەو مافانە بداتە خەڵك کە خۆی بەڵێنی پێدابوون، کۆمەڵە نوێنەرێکی لە دەوری خۆی کۆکردەوە کە حەزیان دەکرد لە پێناوی کۆنترۆڵکردنی خەڵکدا پیلانگێڕیی بکەن و دەست بۆ بێبەزەییترین کاربەن- ئەو هەمیشە جەختی دەکردەوە کە ئامانجی فەراهەم کردنی زۆرترین کاری باشە بۆ زۆرترین ژمارە لە خەڵك، و هەر بۆیەش ئیتر ئامانج ئاراستەی ئامرازەکانی دەکا.



## ساڵانی کۆتایی تەمەنی لینین



ستالین (لای راست) سوودی لە بێ توانایی جەستەیی لینین وەرگرت

لە مانگی مایسی ١٩٢٢دا لینین چەند جارێك تووشی سەکتەی دەماغ هات. ئەو لە یەکەمین (سەکتەدا) چاك بۆوە و بەرادەیەك توانی بە ئەرکی خۆی رابگا، بۆ ئەوەی چنگی لە دەسەڵات گیر بکا. بەڵام لە مارتی ١٩٢٣ دوایین سەکتە ئەوی بۆ هەمیشە دەردەدار و لاواز کرد و حاڵی بەدەنی ئەو بە ئاشکرا پێیەوە دیاربوو. هەرچەند لینین تا کاتی مردنی توانی بەسەر حکوومەتی خۆیدا تا ساڵی ١٩٢٤ کۆنترۆڵی هەبێ، بەڵام بێ توانایی بەدەنیی ئەوی لە میتینگەکان و کۆبوونەوەکان دووردەخستەوە، و مەیدانی بۆ هەڵپەرستان، بە تایبەتی ژۆزیف ستالین، ئاوەڵادەکرد تا پێگەی خۆی بۆ ململانێ لەسەر دەسەڵات، کە مسۆگەر پاش مردنی لینین روویدەدا، بەهێز بکا. روی. ئەی. مدودف، مێژوونووسی هەڵکەوتووی سۆڤیێت کەڵك وەرگرتنی ستالینی لە لینین لە ماوەی دوایین نەخۆشیدا بەم شێوەیە شرۆڤە کردووە: ((ستالین بە دڵڕەقیی و پەستیی خودی خۆیەوە.. هەوڵی دەدا لینین لە چاوپێکەوتن دووربخاتەوەو لە بیستنی زانیاری پەیوەست بە کاروباری حیزب و جیاوازی بیروبۆچوونەکان بێبەش بکا، ئەمەش بە بیانووی ئەوەی کە بیستنی ئەم جۆرە هەواڵانە بۆ تەندورستی لینین زیانی هەیە.))[٢٢]

لینین، یەکەمین دیکتاتۆری کۆمۆنیست، لە نامەیەکدا روو لە هاوسەنگەرانی لە کۆمیتەی ناوەندی، دەکا و ناوەڕۆکی نامەکەش پاش مردنی لینین ئاشکرا بوو، لە نامەکەدا داوای کردبوو کە ستالین دەربکەن. ستالین پێشتر، لە رێگای پلەیەکەوە کە بۆ ئەو هێنرابووە کایەوە، خۆی بۆ ئاستی سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیست، ئەو ئاستەی کە هەرگیز لینین داوای نەدەکرد، بەرزکردبۆوە. لینین لە نامەکەیدا کە پاشان بە ((وەسیەتنامەی لینین)) ناوبانگی دەرکرد، روانینی خۆی لە بارەی پیاوێکەوە کە سەرەنجام بووە جێنشینی ئەو، ئاوا رادەگەیەنێ:



**گۆڕی لینین لە مەیدانی سوور لە مۆسکۆ**

هاوڕێ ستالین ئێستاکە بووەتە سکرتێری گشتی حیزب، هێزێکی بێ سنووری بۆ خۆی پێکەوەناوە، و من لەوە دڵنیانیم کە ئەو هەمیشە بتوانێ ئەو هێزە بە خۆپارێزییەکی تەواوەوە بەکارببا... ستالین زۆر توندوتیژە. و هەرچەندە ئەم کەمایەتییە لە نێو ئێمەدا بە تەواوی شیاوی تەحەمول کردنە... ئەوا سەبارەت بە کەسێك کە ئەرکی سکرتێری گشتی بە ئەستۆوەیە شیاوی تەحەمول کردن نییە.[٢٣]

لینین لە بەرواری ٢١ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٤ کۆچی دوایی کرد. گۆڕی لینین وەکو مەزارگایەکی ناروحانی لێهات، بە درێژایی دەیان ساڵ ڕۆژانە خەڵکێکی زۆری بۆ خۆی رادەکێشا. دەوڵەتیش بۆ رێزلێنانی وی، پایتەختی پێشوو، پەترۆگرادی ناونا لینینگراد.

## (٣)

## سەردەمی ستالین ١٩٢٤- ١٩٥٣

ژوزیف ستالین لە ساڵی ١٨٧٩ لە گورجستان، ناوچەی شاخاویی روسیا کە پاشان بووە یەکێك لە کۆمارەکانی روسیا، هاتە دنیاوە. لە پازدە ساڵیدا لە قوتابخانەیەکی زانستیدا خۆی ناونووس کرد. بەڵام بەر لە تەواوکردنی خوێندن لەوێ دەرکرا. پاش ئەوە بە حیزبی سۆسیال دیموکراتی کرێکاری روسیاوە پەیوەست بوو، بوو بە یەکێك لە لایەنگرە رادیکاڵەکانی شۆڕش. کاتێك لە ساڵی ١٩٠٣ حیزب بۆ دوو باڵدا بەش بوو، ستالین بە رادیکاڵترین باڵ، مانای بەلشەفیکەکانەوە، پەیوەست بوو. ساڵی ١٩٠٧ بە رەزامەندی لینین، لە رێگای دزینی باری گالیسکەیەکەوە کە بڕێکی زۆر پارەی تزاری هەڵگرتبوو، بۆ دابینکردنی دارایی چالاکییەکانی بەلشەفیکەکان، هاوکاری کرد. پاش شۆڕشی ١٩١٧ ستالین بوو بە یەکێك لە لێپرسراوانی باوەڕپێکراوی لینین و ئەو بە خێرایی نفووزی خۆی پەرەپێدا.

**ستالین (چەپ) یەکێك لە باوەڕپێکراوترین لێپرسراوانی لینین (ناوەڕاست) کە بەخێرایی نفووزی بەرەو زیادی پەرەی ستاند**



لە ساڵی ١٩٢٢ پلەی سکرتێری گشتی حزبی کۆمۆنیست بۆ ستالین پێکهێنرا. چونکە لینین ئەوی بە کارکردەیەکی بە توانا و وەفادار دەزانی کە شایانی هەڵسووراندنی ئەرکەکانی ئەم پلەیەی هەیە. پلەیەکی ئاوا بە هیچ رەنگێك سەکۆی خۆهەڵدان بۆ پلەیەکی بەرزتر نەبوو، بەڵام ستالین ئەو پلەیەی وەکو پلەی یەکەمی سەرکەوتنی خۆی دانا. ئەو، ئەم پلە نوێیەی خۆی کردە سەکۆیەك بۆ سەرکەوتن، ئەو، لەسەرتاسەری سۆڤێت دەستی کرد بە سەفەرو گەڕان تا لەگەڵ بەرپرسانی خوارووتری ئەندامانی ناوچەیی حیزبدا دیدار بکا و پەیوەندی دۆستایەتی دابمەزرێنێ بەو مەبەستەی، لە هەوڵدانیدا بۆ بە دەست هێنانی دەسەڵات لەداهاتوودا وەکو هاوپەیمانی خۆی ئامادە بن.

### سیاسەتەکانی پۆلیت بوورو — مەکتەبی سیاسی

پۆلیت بوورو بە هۆکاری رێزلێنانیان لە تواناکانی لینین لە پێگەیەکی میانەداو هەروەها پێشینەی دوورودرێژی وی لە پلەی رابەری و بنیاتنەری حیزب، بە جۆرێکی یەکپارچە پشتیوانیان لە لینین دەکرد. بەڵام هەرچەندە لینین تا رادەیەك لەو سەکتە ئیفلیجکەرەی خۆی لە مانگی مایسی ١٩٢٢ چاك بۆوە و پیادەکردنی زۆر لە ئەرکە رابەرییەکانی خۆی ئەنجامدا، بەڵام یەك پارچەیی پۆلیت بوورودایە پاشەکشێ. لە کەشێکی ئاوا گۆڕاودا، کۆمیتەیەکی سێ کەسیی فەرمانڕەوا، کە پێکهاتبوو لە ستالین، لف. ب. کامینیف، گریگۆری و. زینوفیف، سەریان دەرهێنا تا لەبەرامبەر پایەخوازی و سەرکردایەتی خوازی تروتسکی و نیکۆلای. ئا. بووخارین، کە یەکێك بوو لەو کەسانەی کە بە باوەڕی زۆرانکەس ببووە جێنشینی لینین، خۆیان راست بکەنەوە. وا دەهاتە بەرچاو کە لینین دەسەڵاتی بەسەرداشکاوی لە رێگای راوێژ لەگەڵ هەموو رابەرانی حیزبدا بە دەستدەهێنا. لە ئاکامی ئەم راوێژەوە رەزامەندیی ئەوانی تریش

**نیکۆلای بوخارین باوەڕی وابوو کە کۆمەڵگا بەگۆڕینێکی بەرەبەرەیی بەرەو کۆمۆنیزم دەڕوا**

فەراهەم دەبوو. لە راستیدا بالادەستی ئەو بەسەر پۆلیت بورۆدا لە ڕێگای سەپاندنی ئیرادەو بێبەزەیی ئاشکرای ئەوەوە فەراهەم دەبوو. پشتیوانی کردنی پۆلیت بورۆ هەر ئاوا لە خۆوە کۆمیتەی سێ کەسیی نەدەگرتەوە.

ستالین بە زوویی ناچار بوو لەگەڵ دوو کەسەکەی کۆمیتەی سێ کەسیی و هەروەها لەگەڵ ئەندامانی تردا کە بانگەشەیان بۆ چنگ گیرکردن لە دەسەڵات دەکرد، مانای تروتسکی و بووخارین، بکەوێتە ململانێوە. کامینیف و زینوفیف لەگەڵ تروتسکی یەکیان گرت و لە دژی ستالین راپەڕین، بەڵام بە هۆکاری دەسەڵاتی ستالین لە پێگەی سکرتێری گشتی حیزب، بە زوویی نفووزی خۆیان لە دەستدا.

سەرهەڵدانی سێداواکار بۆ جێنشینی رابەر، یان لە راستیدا رابەری سۆسیالیستی، یەکێك لە لاوازییەکانی حکوومەتێك بوو کە لینین بنیاتی نابوو. لەو جێیەوە لە یەکێتیی سۆڤێتدا دەسەڵات لە سەرەوە بۆ خوارەوە دەهات، کاتێك رابەری پێگەی بالا دەمرد، بە تالایی لە دەسەڵاتدا ئاشکرا دەبوو. بۆ هەڵبژاردنی رابەران لە لایەن خەڵکەوە، رێ و شوێنێکی دیموکراتی بوونی نەبوو.

پاش مردنی لینین، کێشەو ناکۆکی لەسەر بەدەستهێنانی دەسەڵات، لە دەمەتەقێ و کێشمەکێشمێك بۆ بەدەستهێنانی بەرزترین پلەی یەکێتیی سۆڤێت، زیاتر بوو؛ ئەم کێشەو ناکۆکییە لە هەمانکاتیشدا مل ملانێیەکی ئایدۆلۆژیش بوو لە نێوان هەوادارانی بیروباوەڕی ناکۆك بە یەکتری لە پێناوی گەیشتن بە حکوومەتێکی کومۆنیستی ئایدیالیدا. تروتسکی و هەوادارانی، کە بە بەباڵی چەپی حیزب ناوبانگیان دەرکردبوو، داژدارییان لە سۆسیالیست کردنی روسیا لە کورتترین ماوەدا، هەروەها لە سیاسەتێکی دەرەوەی بەرزەفڕانە کە هاندان و هاوکاری گەیاندنی جیدی و کردەنی بۆ شۆڕشی جیهانی بگرێتە خۆی تا لە سایەی ئەودا سەرکەوتنی کۆمۆنیزم زامن ببێ دەکرد. باڵی راست، کە بووخارین و هاوپەیمانەکانی دەگرتەوە، سەرنجی لەسەر کاروباری ناوخۆ بوو، و باوەڕی وابوو کە دەبێ بە درێژەدانی سیاسەتی نوێی ئابووری لینین پلەبەپلە گۆڕینێك بێتە ئاراوە تا کۆمۆنیزم دێتەدی، و ئەم سیاسەتە بۆ خۆی ڕێگادەدا ڕێکخراوی بچووك بە شێوەی تایبەت چالاکی بنوێنن، لە حاڵێکدا پیشەسازی گەورە دەبووایە سەر بە ناوەند بکرێن.



## کۆمۆنیزم لە یەك وڵاتدا

ستالین هێڵی ناوەڕاستی لە نێوان ئەم دوو باڵە توندڕەوەدا گرتە بەر، ئەویش بە خستنەڕووی ئەو تیۆرییەی لینین خستبوویە روو: ((کۆمۆنیزم لە یەك وڵاتدا)) بەپێی ئەم باوەڕە، بێ ئاتاج بوون بە شۆڕشی جیهانی و بە چاوپۆشی لەوە، ئایا هەموو وڵاتان سۆسیالیزم هەڵدەبژێرن یان نا، پێویستە بە شێوەی شالاو بردن سۆسیالیزم لە یەکێتیی سۆڤێتدا بلاوبکرێتەوە. ئەم هەڵوێستە لە باوەڕەکانی بووخارینەوە نزیك تر بوو، و ستالین توانی پشتیوانی ئەندامانی باڵی راست بۆ خۆی رابکێشێ، و ئەم کارە بە ئەندازەیەکی پێویست هێزی بە ستالین بەخشی تا بتوانێ تروتسکی و هاوپەیمانەکانی لە پێگەی خۆیان لە نێو حیزبدا لابدا. تروتسکی بەدناو بێ بەها کراو ناچار بوو مل بۆ دوورخستنەوە بدا. هاوپەیمانەکانیشی کەوتنە بەر زوڵم و ئازارو زۆرێك لەوان دەرکران. روی مدودف دەنووسێ: ((سەدان کەس لە پەیڕەوانی تروتسکی دەستگیرکران. هەندێك لەوانە بە بەڵگەی هەبوونی پەیوەندییەکی واقیعی لەگەڵ تروتسکی، بەڵام زۆر لەوان بە بەڵگەی پەیوەندییەکی خەیاڵی لەگەڵ ئەو دەستگیرکران.))[٢٤].

بەڵام ستالین تا پێش بەهاری ١٩٢٩ لە دژی بووخارین و پەیڕەوانی دەست پێشکەرییەکی نەکرد، تا ببێتە تاکە سوارو رابەری بێ رکابەری یەکێتیی سۆڤێت.

لە زۆر لایەنەکانەوە ((کۆمۆنیزم لە یەك وڵاتدا)) یان ((سۆسیالیزم لە یەك وڵاتدا)) لە راستیدا هەمان سیاسەتی نوێی ئابووری لینین بوو. بەڵام بە ناوێکی ترەوە. لە لایەنەکانی دیکەی ئەم تێزە، تێزێکی دروست کراو بوو کە مۆڵەتی بە ستالین دەدا کە بە هەموارکردنی تێزەکە یاری بە کاروباری ئابووری بکا: زەمەنێك لە پیادەکردنی بنەڕەتە واقیعییەکانی کۆمۆنیزمدا بچێتە پێشەوە، زەمەنێکی تر پاشەکشێی لێبکا، ئەمەش لە حاڵێکدا، بە دەنگێکی بەرز هەواداری بێ سێ و دووی خۆی لە بنەماکانی مارکسیزمدا رادەگەیەنێ. هەرچەندە قۆناغی پیادەکردنی سیاسەتی نوێی ئابووری پاش مردنی لینینیش نزیکەی چوار ساڵ درێژەی هەبوو، جۆرێك هەڵگەڕانەوە لە کۆمۆنیزم بوو، بە هیچ رەنگێك بە هەڵگەڕانەوە بۆ حیزبی کۆمۆنیست نەژمێردرا. لە میانی ئەو ساڵانەدا، ستالین کەوتە سەرباری بەهێزکردنی دەسەڵاتی خۆی، و هەروەها لەگەڵ گشت وڵاتانی ئەوروپاییدا پەیوەندی دامەزراند، و بۆ گۆڕینی وەزع بە کۆمۆنیزمی (واقیعی) بەرنامەی دانا.

شێوازی هەڵبژاردنی ستالین بۆ گەیشتن بە کۆمۆنیزم،داڕژتنی خشتەیەکی زەمەنی تۆکمەو سەخت بوو بۆ هێنانەدی گۆڕانکاری پێویست، گۆڕانکارییەك بۆ گەیشتنی بە جۆرە





سیستەمێکی ناوەند گرتوو و کۆنترۆڵکراو. ئەو بۆ هێنانەئارای ئەو ئاڵوگۆڕە لە قۆناغەکانی زەمەنی پێنج ساڵەدا، کۆمەڵە ئامانجێکی لەبەرچاوگرت و وردەکاریی ئەوانیشی لە یەك زنجیرە بەرنامەی پێنج ساڵەدا شیکردەوە. لانی کەم لە سەرەتای کاردا وادەهاتە بەرچاو، ستالین ئەم سیستەمە تازەیە بۆ تەواوکردنی هەمان سیاسەتی نوێی ئابووری بەکاردەهێنێ.

## سیاسەتی نوێی ئابووری لە سەردەمی ستالین

سەردەمی سیاسەتی نوێی ئابووری تا رادەیەك لەگەڵ ئازادی دەربڕیندا هاوکات بوو، ئەو شتەی، لە زەمەنی لینیندا شیاوی قبووڵ کردن نەبوو، و پاش ئەوەش هەر نەدرایە خەڵك تا سەردەمی گلاسنۆست لە دەیەی ١٩٨٠، ئەم حاڵە، هەروەکو کە نووسەرانی توێژینەوەی وڵاتی یەکێتیی سۆڤیێت دەینووسن خوێندنەوەی هەلومەرجی وڵات ئەوە نیشان دەدا، ستالین تەنیا زەمەنێك ئەو ئازادییانەی دەدایە خەڵك، کە هەستی دەکرد وڵاتەکە سوودی لێ وەردەگرێ: ((نووسەرانی کومۆنیست، ماکسیم گورگی و فلادیمیر مایاکوفسکی، لە میانەی ئەو قۆناغەدا چالاك بوون، بەڵام نووسەرانی تر، کە نووسینی زۆرێك لەوان لە پاشاندا کۆکرانەوە و قەدەغەکران، کۆمەڵە بەرهەمێکیان کە لە ناوەڕۆکی سیاسی سۆسیالیستی بەدەر بوو، بلاوکردەوە. فلیمسازی، وەکو ئامرازێك بۆ نفووزکردن لە کۆمەڵگایەکدا نەخوێندەواری زۆری تێدا بوو، بووە جێگەی هاندانی بەرپرسانی دەوڵەت.))[٢٥] هەر لەو حاڵەدا، قوتابخانەکان پەرەیان ستاند. قوتابخانەی شەوانە بۆ کەسانی بە تەمەن، کە کاریان دەکرد لە واری کەمکردنەوەی بەربلاویی نەخوێندەواری و ئەندامانی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگا کە ئامادەیی ئەوەیان تێدابوو لە خوێندنی بەرز بەهرەمەند بن، شوێنەواری دانا.

ئەم جۆرە ئازادییە راگوزەرانە لە هەر کات و زەمەنێکدا کە ئامانجەکانی ستالین پێویستی بووایە هەڵدەوەشایەوە. مەبەستی بنەڕەتیی لە کەمکردنەوەی تۆتالیتاریزم لە قۆناغی سیاسەتی نوێی ئابووریدا، رێکوپێك کردنی وەزعی ئابووری و رزگارکردنی ئابووری لە سۆسیالیست کردنی بە پەلە بوو.





**نەخشەی ستالین بۆ سۆسیالیزەکردن ئەوە بوو کە پارچە زەوییە بچووك و پەرت و بلاوەکانی جووتیاران بۆ مەزرای گەورەو بەرین بگۆڕێ**

لە ماوەی ئەم قۆناغەدا ئازادی زیاتر لە هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیدا رێگەی پێدرا، لە بارچاوندنی ((کورپەلە)) بووە بە شتێکی یاسایی و تەلاقدانیش ئاسانتر بوو.دامەزراوە و نەریتە باوەکانی کۆمەڵایەتی وەکو هاوسەرگریی نەریتی کاڵ بوونەوە تا وەفاداری بۆ دەوڵەت جێگای وەفاداری بۆ خێزان و کلێسا بگرێتەوە و ئەم رەهەندە ئاسان ببێ. بە تایبەتی ئەنجامدانی رێ و رەسمەمەزهەبییەکان کەوتنە حاڵەتی گوێ پێ نەدانەوە چونکە بە پێی روانینی مارکس ئەم جۆرە مەراسیمانە ئامانجگەلێکی دژە شۆڕشیان هەبوو.  بەو مانایە کە دەرەتان هەبوو بەرچاوی سیاسی خەڵك ئەمومژاوی بکەن و لە ئاکامدا- خەڵك نەتوانن رەسەنایەتی حیکمەتی حکوومەتی کومۆنیستی بزانن. بەو پێیە ((بێ خوایی)) پەرەیستاند و کلێساکان داخران و لە هەندێك شوێندا وێرانکران. هەوڵێکیش بۆ وەفادارکردنی خەڵك بەرامبەر بە دەوڵەت بەرێوە دەچوو، یەکێکیان ئەوە بوو هانی خەڵکیان دەدا، هەواڵگریی بەسەر دۆستان و ئەندامانی خێزانەکانیانەوە بکەن، تا ئەگەر هاتوو لە حاڵەتێکدا ئەو کەسانە بە رادەی پێویست خۆشەویستیی و هۆگرییان بە کۆمۆنیزمەوە نەبوو، هەواڵی ئەوان بگەیەننە بەرپرسانی دەوڵەت، گەرچی لە ساڵی ١٩٢٥دا سیاسەتی نوێی ئابووری، بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی گەیاندبووە ئاستی قۆناغی پێش جەنگی یەکەمی جیهانی، جووتیاران لە نرخی بەرهەمەکان نارازی بوون و

لە ئەنجامدا، بە ناونیشانی نارەزایی، بەرهەمهێنانیان کەمکردەوە. پرسی زیادبوونی بەرهەمی کشتوکاڵی جۆرە حاڵەتێکی بێ ئامانجی و دوودڵی بەدوو خۆیدا هێنا: بەرەوپێشبردنی سەنعەتیکردن کارێکی پێویست بوو تا بتوانرێ لە سایەی ئەودا، ئامێری پێشکەوتوی کشتوکاڵی دروست بکرێ بۆ ئەوەی بەرهەمی کشتوکاڵی زیاد و چاك ببێ، بەڵام بە سەنعەتیکردنی وڵات بێ بوونی کرێکارانی کارگەکان لە توانابەدەر بوو، و ئەم جۆرە کرێکارانەش تەنیا لە نێو جووتیاران و هەرێمە کشتوکاڵییەکاندا دەتوانرا پەیدابکرێن. بەو ئاوایە بوو کە نەکشتوکاڵ بووژایەوەو نە پیشەسازی.

ڕێگاچارەیەکی ستالین بۆ دوورکەوتنەوە لەو بێ بەرنامەییە خستییە روو یەکەمین بەرنامەی پێنج ساڵە بوو، لە ساڵی ١٩٢٨دا ڕاگەیەنرا. بەرنامەکە لەسەر ئەو بنەمایە هەستا بوو کە بە بوودجەی دەوڵەت پیشەسازی کۆنینەو پاشکەوتووی کشتوکاڵ بە خێرایی پێشبخەن و کاملّ بکەن و کێڵگە سۆسیالیستییەکان بە دەوڵەتی بکرێن و بە پێی بەرنامەیەکی ناوەندگریی ڕێك بخرێن. ملیۆنان کێڵگەی بچووك، و بێ برشت و بێ کەرەسەی جووتیاران، پێکەوە لیکدەدران و بۆ مەزرای سۆسیالیستی بەرین و خاوەن بەرێوەبەرایەتی باش دەگۆڕدران. ستالین باوەڕی خۆی سەبارەت بە سۆسیالیزەکردن، لە کۆمەڵە بەرهەمەکانی خۆیدا بەم شێوەیە راڤە دەکا: ((ڕێگاچارە لەوەدایە پارچە زەوییە کشتوکاڵییە بچووك و پەرت و بلاوەکان بۆ مەزرای بەرین و سازدارو بە تەکنیك گەلی باڵاتر و نوێ ودامەزراو لەسەر بنەمای بەرهەمهێنانی هاوبەش، بگۆڕدرێن))[٢٦]، بەڵام ئەم پێناسە کورتە نەیتوانی پلانێکی کاربڕێنەوە، بۆ هێنانەدی ئەو گۆڕانکارییە بەرینانە، پێکبهێنێ کە لە سۆسیالیزەکردن چاوەڕوان دەکرا.

## سۆسیالیزەکردن

پیادەکردنی بەرنامەی سۆسیالیزەکردن بە هیچ رەنگێك جێگای پەسندکردنی ئەو جووتیارانە نەبوو کە بەرنامەکە دەیگرتنەوە، بە تایبەتی ((کۆلاك))ەکان[٣] کە ژیانێکی ئاسوودەو هەندێك جار وێرا بە خۆشگوزەرانییەکی بەرزیان هەبوو. (نپ) بە قازانجی کۆلاکەکان کاری کردبوو و ئەو دەرەتانەی بەوان دابوو زەوییەکان و ئاژەڵەکانی خۆیان زیاد بکەن، ئێستا

٣- کۆلاك: جووتیارانی خاوەن مولکی روسیا- (فرید جواهرکلام) وەرگێری فارسی.



سۆسیالیزەکردن داوای لەوان دەکرد ئەوەی بە دەستیان هێناوە بیگێڕنەوە. لە کانوونی یەکەمی ١٩٢٩دا ستالین سیاسەتێکی خستەڕوو تا بە پێی ئەوە چینی کۆلاکەکان هەر لە بنەڕەتدا هەڵبووەشێننەوە.



ئەو جووتیارانەی لە هاوکاری کردنی بەرنامەی سۆسیالیزەکردن سەرپێچییان کرد یا گوللەباران کران یا بۆ هەرێمە دوورە دەستەکانی سیبریا دوورخرانەوە

ستالین فەرمانی بە یەکەکانی سوپا کرد تا بچنە ناوچە گوندییەکان و بەرنامەی سۆسیالیزەکردن ڕێکبخەن. ئەو جوتیارانەی، لەو ڕێگایەوە هاوکارییان نەدەکرد بە پێی ئاستی سەرپێچییان تەمبێ دەکران. ئەوانەی کە توندترین نارەزاییان کردبوو، گوللەباران کران. ژمارەیەکیشیان بۆ هەرێمە دوورە دەستەکانی رۆژهەڵاتی سیبریا دوور دەخستنەوە و هەروەها بەشێکیشیان ناردنە ئوردوگاکانی کاری زۆرەملێ و ماڵ وداراییان زەوت دەکردن و دەیاندایە کارگوزارانی دەوڵەت. یان گری وا مەزندە دەکا کە ((زیاتر لە پێنج ملیۆن کۆلاکیان بۆ سیبریا و هەرێمەکانی جەمسەری باکوور دوور خستەوە، لەو ژمارەیە بەلای کەمەوە چارەگێکیان لەناوچوون. ژمارەیەکی زۆر زیاتریش لە گوندەکانی خۆیاندا لە بەرگریی لە دارونەداری خۆیان کوژران.))(٢٧) تا ساڵی ١٩٣٢ لە دوادواییەکانی یەکەمین پلانی پێنج ساڵەدا، زیاتر لە شەست لە سەدی هەرێمە گوندنشینەکان کەوتنە نێو بەرنامەی سۆسیالیزەکردنەوە ئەم ئاستە سەرەنجام گەیشتە نەوەد لە سەد.





***فێرکردن و پەروەردەی ستالینی***

*ریچارد لوری، لە کتێبەکەیدا بە ناوی مێژووی سەرزارەکی روسیا لە شۆڕشەوە تا ئەمڕۆ، بەسەرهاتی پیاوێکی خەڵکی سۆڤێت دەنووسێتەوە کە بیرەوەرییەکانی قۆناغی خوێندنی خۆی لە سەردەمی ستالیندا دەگێڕێتەوە:*

*مامۆستاکەمان ستالینیستێکی واقیعی بوو، ئەو ژنە بێبەزەیی و کارامەیە، بە دەستێکی ئاسنین فەرمانڕەوایی ئێمەی دەکرد. بەڵام ئەو هەمیشە جەختی لەوە دەکردەوە ئێمە هەموومان براین، هەمووان لەگەڵ یەکتردا یەکسانین. هەموو گرفتەکان لە رێگای ئەوەوە چارەسەر دەکران. ئەو چاوەڕوانیی لە ئێمە ئەوە بوو کە بچینە لای ئەو و سیخوڕی و هەواڵگریی بەسەر هاوپۆلەکانمانەوە بکەین- پیترۆف راهێنانی خۆی لەبەر فلان یان فیسار نووسیەوە. ئەو ئێمەی هان دەدا سیخوڕی بەسەر یەکترییەوە بکەین. لە پۆلەکەماندا وێنەیەکی گەورەی پاولیك موروزف هەبوو. بە ئێمەیان گوتبوو کە لە قۆناغی سۆسیالیزەکردندا، هەندێك لە جووتیاران دانەوێڵەی خۆیان دەشاردەوە. باوکی پاولیکیش دانەوێڵەی خۆی شاردەوە، ئەو کاتە پاولیك ئەم هەواڵە دەگەیەنێتە بەرپرسانی دەوڵەت. ئەو قارەمان بوو. پێشڕەوێکی واقیعی بوو کە هاوکاری وڵاتەکەی کرد. ئەو لە پێناوی خێروخۆشی وڵاتەکەی، تەنانەت لە باوکی خۆشی چاوپۆشی نەکرد. پێشڕەو دەبێ راستی بڵێ. ئەو کارەی پاولیك کردی و بە هۆی ئەو راستی گوتنەوە بوو کە ئەو بە دەستی ژمارەیەکی تر لە جوتیاران کوژرا. وڵات و حیزب لە باوکتان گرنگ ترن، ئەمە ئەو ئەنجامە بوو کە چاوەڕوانیی دەکرا ئێمە پێی بگەین.*



**فێرکردن و پەروەردە لە سەردەمی ستالین جیدی و سەخت بوو.**
**منداڵەکانیان فێر دەکرد تا سیخوڕی بەسەر یەکتری و خێزانەکانیانەوە بکەن**



بە هەموو ئەو حاڵانەوە، بەرنامەی سۆسیالیزەکردن سەرکەوتنی بەردەوامی نەبوو. جوتیاران لە بەرامبەر ئەو بەرنامەیەدا بەرهەڵستییان نواند. بەرهەڵستی ئەوان لە رێگای کوشتن و خواردنی ئاژەڵەکانیان، تێکدانی کەرەسەکانی کشتوکاڵییان و سووتاندنی بەروبوومەکانیانەوە، بەڕێوە دەچوو. بەو رەنگ و رێیە جووتیاران بەربەستییان لەوە دەکرد کە دەوڵەت لە دەست رەنجی ئەوان کەڵك وەربگرێ. لە ئەنجامدا، لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٣٠ قاتی و نەبوونی بەشی سەرەکی وڵات و بەتایبەتیش ئۆکراین و باکووری قەوقازی داگرت، و نزیکەی پێنج تا دە ملیۆن کەس بە هۆی برسێتییەوە، لە بەین چوون.

## سەنعەتیکردنی دەوڵەتی: بەرنامەگەلی پێنج ساڵە

ڕویەکی دیکەی یەکەمین بەرنامەی پێنج ساڵە و دوو بەرنامەی پێنج ساڵەی دواتر، سەنعەتیکردن بوو. لەوانەیە ستالین لەو رووەوە بایەخی خۆی لەسەر سەنعەتیکردنی بە خێرایی وڵات چڕکردبێتەوە کە روسیا لە میانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا یەکەمین هۆکاری بێ توانایی پیشەسازیی خۆی بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی سوپا، ئازارێکی زۆری چێشتبوو، ئەو، کۆمیسیونێکی بەرنامەرێژی دەوڵەتی بە ناوی گۆسپلان پێکهێنا کە لە ژێر چاودێری راستەوخۆی خۆی و(گشت بەرپرسانی پلە بەرزی دەوڵەتیدا) بەڕێوە دەبرا.



**ستالین بەتوندی بەو بابەتە دڵگەرم بوو کە سەنعەتیکردن بەخێرایی پیادەبکرێ ئەو بەتایبەتی جەختی لە دروست کردنی ئامێرەکانی کشتوکاڵی، ئۆتۆمبێل، دەزگای تۆرنەو وێستگەی کارەبا دەکردەوە**

لەو جێیەڕا کە یەکێتیی سۆڤیێت لە هەموو وڵاتانی دیکەی پیشەسازی زۆر پاشکەوتوو تر بوو، گرنگترین بەرنامەی پیشەسازی، دروستکردنی دەزگاکانی تۆرنە بوو، بەو مانایە کە ئامێرگەلی ئەوتۆ دروست بکرێن کە خۆیان بتوانن ئامێری تر دروست بکەن. ستالین بەتایبەتی جەختی لەسەر بەرهەمهێنانی ئامێری کشتوکاڵی، ئۆتۆمبێل و وێستگەکانی کارەبا دەکردەوە.

بەڵام داڕێژەرانی ئەم نەخشانە لەو گوشارەدا، بۆ گەیشتن بە وڵاتانی ڕۆژئاوا، بەکاریان دێنا زۆرێك لە پێداویستییەکانی خەڵکی سۆڤیێتیان دابووە بەر شەماڵی فەرامۆشییەوە. کەرەسەکانی خواردەمەنی بە دەگمەن کەوتبوون. تەندروستی و چۆنایەتی ئاو هاتبووەخوارەوە و خانوو، بە تایبەتی لە شارەکان، بەڕادەی پێویست نەبوو، یەکەمین پلانی پێنج ساڵە وایکرد پیادەکردنی پلانی دووەم و سێیەمیش بە دووخۆیدا بهێنێ. لە بەرنامەکانی دواییدا زیاتر جەخت لە چاکسازیی چۆنایەتی بەرهەمەکان دەکرایەوە تا لەو ڕێگایەوە کەم و کورتییەکانی بەرنامەی یەکەم ڕاست ببنەوە. لە هەمانکاتدا، چڕکاری بنەڕەتی لەسەر پیشەسازییە قورسەکان بوو.

## چینێکی دەسبژاردەی نوێ لە سۆڤیێت سەرهەڵ دەدا

هێنانەکایەی کێڵگەی سۆسیالیستی لە گوندەکان و سەنعەتیکردنی شارەکان، هاوڵاتیانی سۆڤیێتی لە ئازادییە بنەڕەتییەکانی خۆیان وەکو هەڵبژاردنی جێگای ژیان و هەڵبژاردنی جۆری کار، بێبەش کرد. سەفەرکردن لە وڵات سنووردارو وابەند کراو، لە ڕێگەی هێنانەئارای جۆرە گوزەرنامەیەکی ناوخۆییەوە شێوەی بەخۆوەگرت. لە ئەنجامدا بۆ ئەو خەڵکانەی لە کارەکەی خۆیان یان شوێنی ژیانی خۆیان ناڕازی بوون، جێگۆڕکێ لە وڵاتدا بووە کارێکی دژوار. هەر لەو حاڵانەدا، ستالین یەکێك لە پرەنسیپەکانی مارکسیزمی، کە بە لای لینینەوە یەکجار خۆشەویست بوو، هەڵوەشاندەوە. ئەو پرەنسیپەش تەنیا بریتی بوو لە پرەنسیپی یەکسانیی نێوان هەموو هاوڵاتیان. ستالین چینێکی دەسبژاردەی خاوەن ئیمتیازی هێنایەئارا، چینێك لە هاوڵاتییان کە بە درێژایی مێژووی یەکێتیی سۆڤیێت بەردەوام بوو. ئەو کەسانەی کە خاوەنی توانا، هەڵکەوتویی و لێهاتوویی تایبەتی بوون، لە جۆرە چاودێرییەکی تایبەتی بەهرەمەند دەبوون، وەکو خانووی باشتر، ئیمتیازاتی زیاتر لە واری سەفەرکردن، بە دەستکەوتنی خواردەمەنیی و پۆشاکی بەرزو نایاب. ئەم چینە خاوەن ئیمتیازە تەنیا تایبەت بە بەرپرسانی پلەبەرزی حیزبی و بەڕێوەبەرانی باڵاترەوە، پەیوەست نەبوو. بەڵکو میوزیك کاران، نووسەران،



وەرزشکارانی قارەمان، کەسانێکیش دەکرا لە کاروباری ڕاگەیاندندا کەڵك لە تواناکانیان وەربگیرێ، دەگرتەوە.

بینینی سەرهەڵدانی سەرکەوتوانەی چینی دەسبژاردان و هەروەها پیادەکردنی سیاسەتی نپ، لەڕاستیدا پاشەکشێ کردن بوو لە سۆسیالیزم، لە دڵەڕاوکێی وڵاتانی دیموکراتیکی ئەورووپای لە بارەی ئامانجە سیاسیە دێو ئاساکانی دراوسێیی خۆیان، کەم کردەوە. لە لایەکی ترەوە وا دەهاتە بەرچاو ستالینیش کەمتر بە لای شەڕێکی توندی هەروەکو جەنگی یەکەمی جیهانی بێ لەگەڵ دوژمنانی وڵاتەکەی. بەو پێودانە کاتێك یەکێتیی سۆڤیێت لەو ناکۆکییە وێرانکەرە دەرباز بوو، ئیدی هێندە ئاخاوتنی لە بارەی شۆڕشی جیهانی، کە یەکەمجار لینین و پاشان ستالین هێنابوویانە پێشەوە، نەدەکرا، بەڵکو سۆڤیێت هەوڵی دەدا کارێك بکا، لەلایەن وڵاتانی سەرمایەدارییەوە بە ڕەسمی بناسرێ. هەمان ئەو وڵاتانەی کە زەمانێك هیوادار بوو بە هەڵوەشاندنەوەی ڕژێمی سەرمایەدارییان بە ڕوسە کۆمۆنیستەکانەوە پەیوەست بن. سەرەڕای هەموو ئەمانەش ستالین درێژەیدا بە پشتیوانی کردن لە ڕێکخراوی کۆمنترن ئەو ڕێکخراوە نێو نەتەوەییەی لە ساڵی ١٩٢٢دادامەزرا و ئامانجی بەرپاکردنی شۆڕشی جیهانی بوو، تا ئەوەبوو لە میانی جەنگی دووەمی جیهانی هەڵوەشایەوە؛ ئەمە ئیمتیازێك بوو ستالین دایە هاوپەیمانەکان.

سەرەڕای سەرکەوتنی نپ، یا لەوانەیە بە بەڵگەی ئەوە، لە کۆتایی دەیەی ١٩٢٠ ستالین وردە وردە لە هەندێك لە ئەندامانی حیزب بەدگومان بوو- ئەوانەی کە بە پێی وێناکردنی ستالین بە ڕادەیەکی پێویست حەز بە مانەوەی ڕابەریی ئەو و تێپەڕبوون لە (نپ)ەوە بەرەو بەرنامەی سۆسیالیزەکردن، ناکەن. ستالین بۆ لە نێوبردنی ناڕازییەکان و لە ڕێ لادانی توندئامێز لە ڕێبازێك ئەو مەبەستی بوو وڵات پێیدا تێپەڕێ، بەرنامەیەکی بۆ نەهێشتنی سیستماتیکیانەی ناڕازییانی سیاسی خۆی، جا ناڕەزاییانی خەیاڵی بن یان ناڕازییانی واقیعی، جێبەجێ کرد. ئەو بەرنامەیە کە بە(پاکتاوکاری) ناوبانگی دەرکرد، بە زۆری بە ئاراستەکردنی تۆمەتی بێ وەفایی بەرامبەر بە حیزب یان تاوانی دیکە بەرامبەر کەسانی تر دەستی پێدەکرد، و پاشان سەری بۆدادگا، بەندیخانە و تەنانەت لە سێدارەدانی ئەوان، دەکێشایەوە.





## پاكتاوكارییەكان

(پاكتاوكارییە گەورەكان)تا رادەیەك لە ١٩٣٤ تا ١٩٣٩ پیادەكرا. بەڵام ستالین لە تەواوی ماوەی دەسەڵاتدارێتی خۆیدا دەستی بۆ پاكتاوكاری سنووردار دەبرد، پاكتاوكاری لاوازتر لە كۆتایی دەیەی ١٩٢٠ دەستی پێكرد، لە هەمان زەمەندا بوو كە كۆششی بنەڕەتی ستالین



**كرێكارانی روس ئەنجامی دادگایی كردنێك تەئید دەكەن ئەوە یەكێك لەو زۆرەها دادگاییانە بوو كە دەرفەتی دەدایە ستالین تا نەیارانی خۆی لە بەین ببا**

لەسەر بەلاوەنانی نپ و پیادەكردنی بەرنامەی سۆسیالیزەكردن لە جێگای ئەودا چڕ ببۆوە. نیكۆلاس ریاسا نوڤسكی مێژوونووس، پاكتاوكارییە گەورەكان بەم شێوەیە راڤە دەكا: ((پاكتاوكاری گەورەی ستالین، لە ریشە دەرهێنان و سەركوتكردنی بنەڕەتی هەموو نارازییەكانی خۆی و بەدەستهێنانی دەسەڵاتی دیكتاتۆری موتڵەق بوو))[٢٨]. ژمارەیەك لە بەرپرسان، لەوانە بووخارین كە سەردەمێك ركابەری ستالین بوو، بە بەڕێوەبردنی كۆمەڵە كردارێكی دژە شۆڕش تۆمەتباركرا، و وەكو ((لەرێ لادەرانی راستڕەو)) ناسێنرا. ئەو بەرپرسانە لە كاری خۆیان و هەروەها لە حیزبیش دەركران. لە ساڵی ١٩٣٤ سرگی كیروف، بەرپرسێكی میانەڕۆی حیزبی لە لینینگراد، كوژرا. لەوانەیە بە فەرمانی ستالین. لە نێوان ئەو كەسانەی كە بە پیلان گێڕان بۆ ئەنجامدانی ئەم كوشتنە تۆمەتبار كران، ناوی كامینیف و زینوفیف دەكەوتە بەرچاو. ئەو دووە هەمان ئەو كەسانە بوون كە لە زەمانی نەخۆشی كۆتایی تەمەنی لینیندا،



بەرێكەوتن لەگەڵ ستالیندا كۆمیتەی سێ كەسییان پێكهێنابوو. زینوفیف و كامینیف تا رادەیەكی نێزیك بە یەقین دەستیان لە كوشتنی كیرۆف دا نەبوو. بەڵام ئەمە بۆ ستالین دەرفەتێكی لەبار بوو تا لە شەڕی ئەم ركابەرانەی پێشووی رزگاری ببێ. ئەم دوانە بە زیندان حوكم دران. هەموو تۆمەتباركراوانی ئەم كوشتنە بۆ ئوردوگاكانی زیندانییەكان لە سیبریا رەوانە كران.

لە ماوەی قۆناغی پاكتاوكردندا، چەندان بەرپرسی پلەبەرزی دەوڵەتی بە شێوەیەكی رووكەشی دادگایی دەكرا، ئەندامانی كۆمیتەی سێ كەسی، لەگەڵ چواردە كەس لە ئەندامانی دیكەی حیزب حوكم دران و لە سێدارە دران. دوو دادگای رووكەشی تریش لە ساڵانی ١٩٣٧و ١٩٣٨ بەڕێوە چوو. لەو زەمانەدا ٣٧ كەس، لەوانەش نیكۆڵای بووخارین، بوونە قوربانی.دادگایی كردنە رووكەشییەكان بە ((دانپێدانەكان))ی دورودرێژی تۆمەتباران پشت ئەستوور بوو. بەو رەنگ و رێیە ئیدی پێویستی بە ئەشكەنجەدەران نەبوو تا بەڵگەو شایەت دژی ئەوانە كۆبكاتەوە یان بە ساختە دروستی بكا. ئەو تۆمەتبارانە لە ژێر ئەشكەنجەدا ((دانپێدانان)یان دەدركاند، بە ئاوایەكی گشتی وشەی (خیانەتكار) دەدرایە پاڵ ناوەكەی خۆیەوە ئیتر دەخرانە بەندیخانە یاخود دەبوونە قوربانی پاكتاوكردن.

***پاكتاوكراوان***

*كەسانی پاشماوەی پاكتاوكارییەكانی ستالین وەحشەتی چاوەڕێكردنی بیستنی تۆمەتی بێ بنەماو بێ بناغەی خۆیان دێتەوە بیر. تاوانی خەیاڵی كە نەدەكرا بەرپەرچ بدرێتەوە. ئادام هوچشیلد لە كۆمەڵە راپۆرتێكی پاشماوەكانی پاكتاوكارییەكاندا بە ناوی تارماییەكی نائارام، گێڕانەوەكانی شایەتحاڵەكان لە گرتوخانەكانداو هەروەها ئەشكەنجەدانی بە كۆمەڵ، ئاوا باس دەكا:*

*ئامانجی بنەڕەتی ئەوەبوو كارێك بكەن بەندییەكە فایلی لێكۆڵینەوەكەی خۆی ئیمزا بكا. زۆرترینی ئەو كەسانە نەخوێندەوار بوون، و بەو پێیە پەنجەمۆری بەندییەكانیان دەخستە سەر هەموو روپەڕەكانی فایلەكە ئەوانەی ئەو كارەیان رەت دەكردەوە، بەم جۆرە ئەشكەنجە دەدران: پەنجەیان دەخستنە نێوان دەرگاو چوارچێوەوە و ئینجا ئەوەندە گوشاریان دەخستە سەر تا پەنجەی دەشكا.*

*ئەو تاوانە تایبەتەی كە ئەو كەسانە بە ئەنجامدانی تۆمەتبار كرابوون چی بوو؟ بۆ نموونە لە كولپاشۆف {شارێكە لە لێواری رووباری ئوب لە ناوەڕاستی سیبریا، شوێنی یەكێك لە كوشتارگەی بە كۆمەڵی پاكتاوە گەورەكان} تۆمەتباركراوان نەخشەیان كێشابوو كە پردی سەر رووباری ئوب بتەقێننەوە. بەڵام لە زەمانی تۆمەتباركردنی ئەواندا پردێكی ئاوا هەر لە جێدا بوونی نەبوو! لە*

*هەرێمی تمسك، بەندییەكانیان تۆمەتبار دەكرد، ویستویانە پردی سەر رووباری تـوم بتەقێننـەوە، ئـەو پردە هەرگیز بوونی نەبوو.*

*بە تێكڕایی، پێویست نەبوو كە پاكتـاوكردنی بـە مەبەسـتی تـەمبێكردنی كۆمەڵـە كەسـانێك بـە هۆكاری ئەوەی كە تاوانی واقیعیان ئەنجامداوە، بەڕێوە بـچێت. ئەگـەر بمانـەوێ ئامـانجێكی جیـدی بـۆ بەڕێوەچوونی پاكتاوەكان وەربگرین، دەبێ بڵێین، پاكتاوكاری بە مەبەستی نانەوەی تۆقاندن و ملكەچی لە نێو رۆحی تاكەكاندا پیادە دەكرا. لە توانا بەدەربوونی ئەو تاوانانە خۆی لە خۆیدا بۆ ئەوە بوو مەدایـەكی تارمایی ئاسا بۆ ئەو تۆقاندنە زیاد بكا. تۆمـەتباركردنی خـەڵكێك بـە بەشـداریكردن لـە پیلانێـك بـۆ تێكدانی پردێك كە بوونی نییە، بایسی ئەوەبوو خەڵك بكاتە قوربانی ئەو خەیاڵەی ئەوان نە تەنیا لە ژێـر ئەسارەتی حكوومەتێكی ستەمكارو بە هێزدا دەژیـن، بـەڵكو دیلـی جـۆرە لـۆژیكێكی ترسـناكی پـەی پێنەبراوی نوێن كە لە دژی ئەو ناكرێ بەهیچ رەنگێك نە سكاڵا بكـرێ، نـە گـوت و بێـژو باسـێك و نـە دەتوانرێ بشسەلمێنرێ ئەو تاوانەی كە ئێوە پێی تۆمەتباركراون كارێكی لە توانا بەدەرە.*

ئەو پاكتاوكردنانە دروست پێش جەنگی دووەمـی جیهـانی بـەڕێوە چـوون، شـوێنەوارێكی وێرانكەری لەسەر هێزی بەرگریی سۆڤێتی لە بەرامبەر دوژمن، بەجێهێـشت. نزیكـەی نیـوەی ئەفسەرانی سوپای سۆڤێتی یـان لـە سـێدارەدران، یـا كەوتنـە بەندیخانەكانـەوە یـاخود بـەرەو ئوردوگاكانی كاری زۆرەملێ لە سیبریا رەوانەكران. زەمانێك پاكتاوكارییـەكان كۆتـایی هـات، ملیۆنان كەس لە هاولاتیانی سۆڤێتی، زۆرێكیان لە ریزی بەرپرسانی دەوڵـەتی یـان حیزبـی وە هاوپەیمان یـان هاودەسـتی پێـشووی خـودی سـتالین بـوون. كـوژرا بـوون، یـان فـڕێ درابوونـە بەندیخانەكانەوە. بەڵگەكانی ئەم پاكتاوانە ئێستاش تەماوی و نادیارن. پاژێك لە مێژوونووسـان لەو باوەڕەدان، ستالین نەخۆشێكی دەروونی بوو. روی مدودف لەگەڵ ئەم گۆشەنیگایەدایە:

دۆزینەوەی رەگەزەكانی نەخۆشی لە نێو رەفتارەكـانی سـتالیندا كـارێكی زەحمـەت نییـە. بەدگومانیی نەخۆش ئاسا، لەسەرتاسەری ژیانی ئـەودا شـیاوی دەستنیـشان كـردن بـوو و لـە كۆتایی تەمەنیدا پتر تاوی سـتاند. قبـووڵ نـەكردنی رەخنـە، سەركێـشی و بووغزخواردنـەوە، زێدەڕەوی لە خۆبینیندا كە دەشكێتەوە بۆ خۆ بەمەزن بینی. بێبەزەیی و دڵسەختییەكی ئاوا لە سادیزمەوە نزیكە هەموو ئەم نیشانە تایبەتییە دەروونییانە، نیـشانەی ئـەوەن كـە سـتالین بـە شێوەیەكی نموونە ئاسا دوچاری پارانویا {بەدگومانیی و سادیزم} بووە))[٢٩].

كەسانی تر لەو باوەڕەدان، ستالین وەكو دواین نێزەی ترسئامێز كەڵكی لە پاكتاوكردن، وەك جۆرە تاكتیكێك بۆ سەركردایەتییەكی بێ ((حساب و كیتاب))و ملكەچییەكی بـێ مـەرج لـە



سیاسەتەكانی، كەڵكی وەردەگرت. رووداوێكی دركە ئـامێز و سـەمەرە، لـە هـەمان سـەردەمدا روویدا ئەم لێڕوانینە پشت راست دەكاتەوە. لە ساڵی **١٩٣٦** یاسای بنەڕەتی پەسەندكرا كە تێیـدا بەڵێنی هەڵبژاردنی ئازاد، مـافی دەنگـدانی خـەڵك و دواجـاریش دانـی مافـەكانی شارسـتانی و ئابووری بە هەموو هاولاتییانی سۆڤێت درابوو، بەڵام ئەو ئیمتیـازە راگەیەندراوانـە، كاریـان پـێ نەكرا، چونكە لەوێدا ئەو مەرجەی تێدا هەڵكێشرابوو كە دەبـێ هـەموو هێـزە سیاسـییەكان لـە لایەن حیزبی كۆمۆنیستەوە پشتگیری بكرین.

بەڵێنی درۆزنانەی ستالین بۆدانی ئازادی زیاتر، فێڵێك بوو بۆ ئەوەی سەرنجی كەسانیتر لەسـەر بەرەنجامە واقیعییەكانی دیكتاتۆریەتی خۆی لاڕێ بكا. ئـەم ئەنجامانـە بـریتی بـوون لـە مردنـی ملیۆنەها هاولاتی سۆڤێتی كە بە هۆكاری قـات و قـڕی یـان پاكتـاوكردن، و ژیـانێكی وێـرا بـە دەستكورتی و تۆقاندن، بۆ زۆرینەی ئەوانەش كە مابوون. ستالین لە ئاسـتانەی جـەنگی دووەمـی جیهانیدا فێڵێكی هاوشێوەی ئەمەی گرتەبەر. ئەو هەوڵیدا تا مرخ و سەرنج تێـبڕینی ئەڵمانـەكان لە سامانەكانی خاكی سۆڤێتی و كانزاكانی ئـەم وڵاتـە بـۆ لایـەكی دیكـە وەربگێـڕێ. بـۆ ئـەم مەبەستە لەگەڵ ئەدولف هیتلەر دیكتاتۆری ئەڵمانیا پەیمانی دۆستایەتی مۆركرد.

## پەیمانی دەستدرێژی نەكردن

لە كۆتایی دەیەی ١٩٣٠ ئەڵمانیا دەسـتدرێژیی خـۆی دژی هاوسـێكانی خـۆی دەسـتپێكردو وڵاتانی لاوازتری وەكو چیكوسلۆڤاك و نەمسای بە خاكی خۆیەوە لكاند. لەوەش زیـاتر، بەقـسەی نیكۆلاس ریاسا نوڤسكی مێژوونووس "{لە ساڵی ١٩٣٦} ئەڵمانیاو ژاپۆن پـەیمانی بـەناوبانگی خۆیان دژی كۆمینترن مۆركرد، كە ئامانجی تایبەتی تێیدا دژایەتی كردنی یـەكێتی كۆمارەكـانی سۆڤێت بوو"[٣٠]. ئەم پەیمانە لەگەڵ كۆمۆنیزمی نێونەتەوایەتیدا نالێك بوو.

كاردانەوەی ستالین لە بەرامبەر ئەو جموجولـە دەسـتدرێژی كارانـە، بـریتی بـوو لـە بەسـتنی پەیمانێكی نهێنی لە زەمینەی دەستدرێژی نەكردن لەگەڵ ئەڵمانیا. ستالین بـەو هیوایـە بـوو لـەو رێگایەوە دەستدرێژیی ئەڵمانیا بۆ سەر وڵاتی خۆی دووربخاتـەوە. بـە پێـی ئـەو پەیمانـە یـەكێتی كۆمارەكانی سۆڤێتی پاش هێرشی ئەڵمانیا لە ئەیلولی **١٩٣٩** بۆ سەر پۆلونیا وداگیركردنـی ئـەو وڵاتە، بەشێك لە خاكی ئەو وڵاتەی لە ژێر دەستی خۆیدا دەگرت، هێرشی ئەڵمانیا بـۆ سـەر ئـەو وڵاتە لە راستیدا كلپەیەك بوو، ئاگری جەنگی دووەمی جیهانی هەڵگیرساند. ماوەیەكی كەم پاش





ئەوە یەکێتیی سۆڤێت دەستدرێژی کردە سەر وڵاتانی لاتڤیا، لیتوانیا و ئستونیا، و وڵاتانی سەر حەوزی باڵتیك، و بە پێچەوانەی ئارەزووی خۆیان، ئەوانی بە خاکی خۆیەوە لکاند.

لە ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٤١ پەیمانی ستالین لەگەڵ هیتلەردا ژێر پێ خرا، و ئەمەش کاتێك بوو کە هیتلەر جارێ شەڕی لەسەر سۆڤێت ڕاگەیاند و سوپاییانی ئەڵمان لە سنووری سۆڤێت پەڕینەوە. پاکتاوکارییەکانی کە ستالین دژی ئەفسەرانی سوپا ئەنجامیدابوو هێزەکانی بە جۆرێکی کارەساتبار لە حاڵی نائامادەییدا ڕاگرتبوو، لە ئەنجامدا، ئەڵمانەکان هەر لە یەکەمین ڕۆژانی هێرش کردنیان، دەستیان بەسەر تفاق و کەرەسە و قەڵەمڕوی سوپای سۆڤێتیدا گرت. لە مانگی تشرینی دووەم سوپای هیتلەر، سۆڤێتییەکانی تا ئۆکراین ڕاوناو دەستیکرد بە گەمارۆدانی لینیگراد.

## جەنگی دووەمی جیهانی دەستپێدەکا

هەوڵەکانی ستالین بۆ دامەزراندنی ناوەندەکانی پیشەسازی، لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا بەکاربرێنەوە و سوودمەند شکانەوە. سۆڤێتییەکان ئەم جەنگەیان بە جەنگی گەورەی نیشتمانیی ناوبرد. لە ڕاستیشدا کاتێك ئەڵمانەکان دەستدرێژییان کردە سەر هەرێمەکانی ڕۆژئاوای یەکێتیی سۆڤێت، سۆڤێتییەکان توانییان پارچەکانی هەموو کارگەکانی کە لەو هەرێمە بوون، هەڵبووەشێننەوەو بەرەو هەرێمە ئارامەکانی باکووری وڵات بیانگوازنەوە. لە ساڵی ١٩٤٣ کارتی جەنگ بە قازانجی هاوپەیمانان هەڵگەڕایەوە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٤دا، سۆڤێتییەکان جارێکی تر لێنینگرادیان خستەوەژێردەستی خۆیان و توانییان خۆیان بگەیەننە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و لە دوایشدا لە کۆتایی جەنگ لە نیسانی ١٩٤٥، پایتەختی ئەڵمانیا، بەرلین، بخەنە ژێر چنگی خۆیانەوە. سۆڤێتییەکان بە هێزەکانی ئەمریکاو ئینگلیز و فەڕەنساوە پەیوەست بوون تاکو ئەڵمانیای تێکشکاو لە جەنگ بۆ دوو ناوچەی نفووزدابەش بکەن: ناوچەی ڕۆژهەڵات ((لە ژێر چاودێری یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤێتی)) وە ناوچەی ڕۆژئاوا ((لە ژێر چاودێری وداگیرکردنی هاوبەشی ئەمریکا و ئینگلیز و فەڕەنسا)).

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئارەزووی دەکرد پیشەسازییەکانی ئەورووپا، کە لە ئاکامی جەنگدا بە شێوەیەکی غەمبار وێران ببوون، هەرچی خێراتر نۆژەن بکاتەوە. ئەوەبوو یارمەتی دارایی و هونەری گەورەی لە ژێر ئالای بەرنامەیەکی ئاوەدانکردنەوەدا بە ناوی ((پرۆژەی مارشاڵ)) خستەژێردەستیانەوە. هەرچەندە یەکێتیی سۆڤێت لە ماوەی جەنگی



دووەمی جیهانیدا هاوپەیمانی ئەمریکا بوو و زەرەرو زیانێکی لە رادەبەدەری قورسی پێکەوتبوو و نزیکەی بیست ملیۆن کەسی لە دەستدابوو، بەڵام لە چوارچێوەی پرۆژەی مارشاڵدا هاوکارییەکی وەرنەگرت. یان گری دەنووسێ: ((لە مبارەیەوە گومان هەیە، ئەگەر کۆنگریسی ئەمریکا ئەوەی پەسەند بکردبایە، یارمەتییەکانی پرۆژەی مارشاڵ بە سۆڤێتیش بدرێ، ئایا سۆڤێت ئەم یارمەتییانەی قبووڵ دەکرد یان نا، چونکە ئەو یارمەتییانە بە کۆمەڵە مەرجێکەوە پێشکەش دەکران هەرگیز بۆ مۆسکۆ شیاوی قبووڵ کردن نەبوو))[31]. بەهەرحاڵ سۆڤێت لە ئاستی داواکردنی یارمەتی لەو بابەتە ڕووی خۆی وەرگێڕاو، هاوپەیمانەکانی خۆشی لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات نائومێد کرد.



**هاتنە ناوەوەی سوپای سووری سۆڤێتی بۆ ناو بەرلین**

ستالین سەرەڕای ڕوحی پرۆژەی مارشاڵ، ئارەزووی دەکرد تا ئەو جێیە کە دەرەتان هەیە قەرەبوو لە ئەڵمانیای تێکشکاو وەربگرێتەوە. بۆ ئەو مەبەستەش هەموو کارگەکانی ئەڵمانیای، لە ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی ئەودا بوون بۆ یەکێتیی سۆڤێت گواستەوە. ئەو دوو میتۆدی کارکردنە جیاوازە لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە بەرپاکردنی ئاشتیدا، نەخشەی ستالینی لە سەر بنەمای پاراستنی کونترۆڵکردنی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و ((نفوز)) لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات (مانای کۆنترۆڵکردنی ئەو ناوچەیەو ململانێی بنەڕەتیی ئایدۆلۆژی لە نێوان کۆمۆنیزم و سەرمایەداری دامەزرا بوو، کێشەو بەرەی نێوان سۆڤێت و ڕۆژئاوا، و

بارگرژیی جیهانی بە دوو خۆیدا هێنایە ئاراوە کە بە جەنگی سارد بەناوبانگە- و ئەم هەلومەرجی بارگرژییە تا زەمانی پاشەکشێی یەکێتیی سۆڤێت درێژەی هەبوو.

## جەنگی سارد دەست پێدەکا

لە واقیعدا جەنگی سارد پێش کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی دەستی پێکرد. گرژییەکانی پێشتر، مانای لە شوباتی ١٩٤٥، لە حاڵی گەلاڵەبووندا بوون و ئەمەش زەمانێك بوو کە ستالین لەگەڵ رابەرانی هاوپەیمانانـدا، فـرانکلین روزفلـت سـەرۆك کۆمـاری ئـەمریکا و ونستون چەرچیل سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا دیداری کرد. ئامانجی ئەو کۆنفراسە، کە لە یاڵتا، لە کەریمە، حەرەمگای ئاسایشی سۆڤێتی هەڵکەوتووە، بەڕێوە چوو، بۆ ئامادەکردنی تێزەکانی پەیماننامەی ئاشتی بوو لەگەڵ دەوڵەتانی تێکشکاوی میحوەر.



**فرانکلین رۆزفلت (ناوەڕاست) ونستۆن چەرچیل (چەپ)وە ستالین لە یاڵتا تێزەکانی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ دەوڵەتانی تێکشکاوی میحوەر تاوتوێ دەکەن**



ئەو دوو مەرجەی لە رێکەوتننامەکەی یاڵتادا رەزامەندی لەسەر پێکهات، لە واقیعدا جەنگی ساردی توندتر کرد. ستالین پێداگریی کرد لە پاش جەنگ، کۆنترۆڵی حکوومەتی پۆڵۆنیای لە دەستدابێ، ئەوی تریان ئەوەبوو کە لە ئاسیا (ژاپۆن)دا بچێتە نێو جەنگەوە. لە بەرامبەر ئەو بەڵێنەشدا کە سۆڤێت بۆ هاوکاری کردن لە کردنەوەی شەڕگەیەکی نوێ لە ئوقیانووسی ئارام دابووی، ئەم وڵاتە مۆڵەتی دەستکەوت کۆنترۆڵی چەند دورگەیەك لە ژاپۆن بخاتە بەردەستی خۆیەوە. ئەگەر ژاپۆن لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٤٥دا خۆی بە دەستەوە نەدابایە، یەکێتیی سۆڤێت بەدەستدرێژی کردن بۆ سەر ئەو وڵاتە چەند بەشێکی داگیر دەکردو جێ پێیەکی بۆ خۆی لە ژاپۆن پێکدەهێنا. بە هەموو ئەم حاڵانەشەوە، ستالین دەیویست لە بەڕێوەبردنی ژاپۆندا پاش جەنگ رۆڵێکی هەبێ. بەڵام هاری ترومان، کە پاش مردنی فرانکلین روزفلت (دوو مانگ پاش کۆنفرانسی یاڵتا) ببوو بە سەرۆك کۆمار، ئەم داوایەی رەتکردەوە.

سیاسەتی دەرەوەی ستالین پاش جەنگ، و لە ئەنجامدا، رێبازی جەنگی ساردی ئەو، کاریگەری لە نەخشەی دێرینەی ئەو لەسەر بنەمای هێنانە کایەی ناوچەیەکی بێلایەن لە نێوان یەکێتیی سۆڤێت و دنیای ناکۆمۆنیست،دامەزرابوو، وەرگرتبوو. ئەم بیروبۆچوونە لە بارەی ناوچەی بێلایەن لە لایەن ئەلکساندەر ورت بەم شێوەیە تەئیدکراوە: "دەشتە تەختەکانی بەشی ئەورووپای روسیا هەر بە درێژایی مێژوو، هەموو شێوە و جۆرە هێرشبەرێکی دەخستە خەڕۆکردنەوە... ئەو هێرشبەرانە کەم و زۆر بە بەردەوامی لە رێگای رۆژئاواوە دەهاتن- بە زۆری لە رێگای پۆڵۆنیاوە؛ لە ساڵی ١٩٤١ ئەوان هاوکات لە چەند وڵاتی ئەورووپای رۆژهەڵاتەوە هێرشیان هێنا، لە رۆمانیاوە بیگرە تا فنلاند."[٣٢]

کۆنترۆڵکردنی ئەورووپای رۆژهەڵات، هەر چەشنە هەڕەشەیەکی لەلایەن ئەو هێرشبەرانەوە بهاتبایە، دووردەخستەوە. بەو پێودانگە، ستالین ئارەزووی دەکرد زاڵدەستیی خۆی بەسەر وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵاتدا بە درێژایی سنووری رۆژئاوای سۆڤێتیدا زامن بکا.

سیاسەتی ناوخۆی ستالین لە پاش جەنگ لە واری کاروباری ناوخۆییدا لەسەر دوو پرەنسیپی سەرەکی دارێژرابوو: نۆژەن کردنەوەی وێرانییەکانی کە بەسەر پیشەسازی هاتبوون و بنیاتنانی سوپایەکی بەهێز. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، بەرنامەی پێنج ساڵەی چوارەم لە ساڵی ١٩٤٦دا پیادەکرا. ستالین بە بایەخدانێکی چڕ لەسەر پەرەپێدانی سوپاو پیشەسازییەکان، جارێکی تر دەرهەق بە پێداویستییەکانی سیستەمی کشتوکاڵی دەوڵەتی و پێداویستییە کاڵاییەکانی ژیانی کرێکارانی پیشەسازی بێباکی نیشاندا. سیاسەتداڕێژانی شارەزای ئەمریکی ئارەزووی

سەرلەنوێ سەرهەڵداوەی ستالینیان بۆ دووبارە سازو پڕچەك کردنەوەی سوپا لەسەر حسێبی بەلاوەنانی پێداویستییەکانی خەڵکەکەی، بە نیشانەیەك لە ئامادەکاری نەخشەی دەستدرێژیکارانە لەداهاتوودا، لە قەڵەمدا.

## سازدانەوەی سوپای سوور لە پاش جەنگ

سازدانی سوپا بە دەستی ستالین، (بۆ جورج. ئف. کنان)ی ئەمریکی پسپۆڕ لە کاروباری یەکێتیی سۆڤێت، پاشان بوو بە بالیۆزی ئەمریکا لە مۆسکۆ، وەکو زەنگی مەترسی بوو. ئەو لێڕوانینی خۆی لە بواری پەیوەندییەکانی داهاتووی ئەمریکاو سۆڤێت لە تیلگرافێکی تێروتەسەلدا بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا شیکردەوە پوختەکەی لە بەرواری تەمووزی ١٩٤٧دا لە چوارچێوەی وتارێك لە گۆڤارێکدا چاپکرا. لەو باوەڕەدا بوو، بەرزەفڕیی فراوانخوازییانەی سۆڤێتی، هەڕەشەیەکی جیدییە بۆ سەر ئەمریکاو جیهان. کنان پێشنیاری سیاسەتێکی کرد کە پاشان بە ناوی سیاسەتی ((بەربەستکردن)) یان ((جڵەوکردن)) ناسرا. روبیرت دانیلز لە شیکردنەوەو شرۆڤەکردنی پاشکۆی تیلگرافەکەی کنان کۆمەڵە خاڵێك باس دەکا:

مەسەلەی {بەربەستکردن}... لەگەڵ بەدگومانی مارکسیزم لە بارەی هێرشی سەرمایەداری، ترسی دێرین و کۆنینەی روسەکان لە جیهانی دەرەوە، "ڕوانینێکی نەخۆش ئاسا بۆ کاروباری جیهان" پترتین و تاوی دەستاند کە ئاراستەیەکی گەلاڵە دەکرد بۆ زیادکردنی هێزی پۆلیس و سوپای سۆڤێتی بەرەو جیاکردنەوەی خەڵکی روسیا لە دنیای دەرەوەو بە ئاراستەی ئەو گوشارە گۆڕاوو هەمیشەییە بۆ زیاترکردنی سنووری هێزی پۆلیسی روس، کە هەموویان پێکەوە فاکتەری پاڵنەری خۆیی و غەریزەیی فەرمانڕەوایانی روس پێکیدەهێنن.[٣٣]

وێڕای دوژمنایەتی ستالین دەرهەق بە رۆژئاوا و تەرخانکردنی رێژەیەکی زۆر لەداهاتی ئابووری سۆڤێتی بۆ کاروباری بەرگری، کە لەگەڵ "ڕوانینی نەخۆش ئاسا"ی ئەو "بۆ کاروباری جیهان" هاوئاهەنگ بوو، ئەو دوایین هەوڵی خۆی بۆ چاککردنی ئابووری سۆڤێتی خستەکار. لە ساڵی ١٩٥١دا ستالین بەرنامەیەکی پێنج ساڵەی دەستپێکرد کە بڕیار بوو تا کۆتایی ساڵی ١٩٥٥ پیادە بکرێ، بەڵام ئەو، ئەوەندە نەژیا، کە کۆتایی ئەو بەرنامەیە ببینێ.



## مردنی ستالین

لە یەکی مارتی ١٩٥٣دا، ستالین لە ئاکامی خوێنبەربوونی مێشك، گیانی لە دەستدا. فرانسیس راندال مامۆستای مێژوو، لەم بوارەدا ئاوا دەنووسێ: "دروست پێش مردنی ئەو، کۆمەڵە دەست گیرکردنێك لەسەر بنەمای گومان لێکردن لە نێو پزیشکان و کەسانیتردا بەڕێوە چوو. وێڕای ئەو دەستگیرکردنانە پڕوپاگەندە گەلێك لە بارەی پاکتاوکردنی تازە دەرهەقی هەموو یان بەشی زۆری ئەندامانی پلەبەرزی حیزب کەوتنە بەرگوێ."[٣٤] دەستگیرکردنی پزیشکان لەو رووەوە بە گومانبار دەهاتە بەرچاو، ئەو دەنگۆ و پڕوپاگەندانەی لە بارەی پیلانگێڕان دژی گیانی ستالین هەبوون، بەهێز دەکرد، بەڵام پیلانی لەمبابەتە هەرگیز ساخ نەبۆوە. سەرەنجام پزیشکان ئازادکران. مردنی ستالین ئەوانی لە پاکتاوکردن رزگار کرد.

دانیل دیلر لە نرخاندنیدا بۆ ستالین قۆناغی ژیانی ئەو بەو شێوەیە پوختە دەکاتەوە:

ستالین رێکخەر بوو، زیاتر پیاوی کار بوو تا تیۆریی وانی... ستالین بە نرخی گیانی مرۆڤگەلێکی یەکجار زۆر توانی یەکێتیی سۆڤێت بۆ دێوێکی پیشەسازی بگۆڕێ... هەوڵ و هەڵپەی سادیستییانەی دەسەڵاتی موتڵەق، ئەوی والێکرد فەرمانی دەستگیرکردن و لە سێدارەدانی زۆران کەس لە هاوسەنگەرانی خۆی بدات و هەروەها بووە بایسی ئەوەی کە بۆ هێنانەئارای رژێمێکی سەرکوتکەر زەمینە خۆش بکا[٣٥].

پاش مردنی ستالین دەستبەجێ، مەسەلەی هەڵبژاردنی جێنشینی ئەو دەستیپێکرد. سەرەڕای ئەو دڵنیاکردنەوەش کە یاریدەدەرانی ستالین لە بواری جۆرە سەرکردایەتییەکی بە کۆمەڵ، بە خەڵکیان دەدا. نیکیتا خرۆشیف بۆ گەیشتن بە دەسەڵات دەستی بە پیلانگێڕیی کردبوو.





## (٤)

## سەردەمی خرۆشیف: ١٩٥٣- ١٩٦٤

نیکیتا خرۆشیف، کوڕی پیاوێکی مەعدەنکار بوو، لە ساڵی ١٨٩٤ لە گوندێکی بچووکدا کە لە باشووری رۆژئاوای روسیادا هەڵکەوتبوو، هاتە دنیاوە. بەر لەوەی لە ساڵی ١٩١٨ بە حزبی کۆمۆنیست پەیوەست ببێ، خوێندنی خۆی لە قوتابخانەی گوندیدا تەواوکرد. لە ساڵی ١٩٣٨ پلەی بۆ سەرۆکی حیزب لە ئۆکراین بەرز بۆوە. پاش جەنگی دووەمی جیهانی بە بەرپرسی بەرنامەی ستالین بۆ نوێکردنەوەی ژیانی کشتوکاڵی هەڵبژێردرا. لە کاتی مردنی ستالین ئەو پایەیەکی شایانی بۆ کێبەرکێ کردن لە پێناوی بەدەستهێنانی پلەی رابەری هەبوو. بەڵام دەستبەجێ پلەیەکی باڵاتری رابەریی بە دەست نەهێنا.



نیکیتا خرۆشیف پاش جەنگی دووەمی جیهانی بە بەرپرسی بەرنامەی ستالین بۆ نوێکردنەوەی ژیانی کشتوکاڵی هەڵبژێردرا

پاش مردنی ستالین سەرەتا وا دەهاتە بەرچاو کە کۆمیتەیەکی پێکهاتوو لە رابەرانی بەرچاو و هەڵکەوتووی سۆڤێتی بە هاوبەشی حوکمی وڵات دەکەن و گیورگی مالینکۆف پلەی سەرۆك وەزیرانی لە ئەستۆدا بوو. لە ساڵی ١٩٧٦دا (روی مدودف)ی مێژوونووس و براکەی ئەو، ژورس، ئەو زانایەی کە بە هۆی ناڕەزایی لە رژێمی یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤێت دوورخرایەوە، روانینی خۆیان لە بارەی سەرکردایەتی بە کۆمەڵ لە یەکێتیی سۆڤێت بەم شێوەیە بڵاوکردەوە:

گەرچی پاش مردنی ستالین



"سەرکردایەتی بە کۆمەڵ" راگەیەنرا، بەڵام رێوڕەسمی دێرین و کۆنی میللەتی روس و رێوڕەسمی ٣٥ ساڵەی یەکێتیی سۆڤێت باڵادەستی رابەرێکی باڵاتری دەسەپاند کە بەهێزو دەسەڵاتەوە کاروباری وڵات بەڕێوەببا. پاش تێپەڕبوونی یەکەمین هەفتە لە (سەرکردایەتی بە کۆمەڵ) بۆ هەر چاودێرێکی بیر تیژ ئاشکرا بوو، کە تەنیا مالینکۆف یان مولوتۆف {یاریدەدەری ستالین و وەزیری کاوباری دەرەوە}یان خرۆشیف خاوەنی ئەو خەسڵەتانەی رابەرین.[٣٦]

چاودێرانی رۆژئاوایی لە پێشبینییە بەراییەکانی خۆیاندا پێشبینی مالینکۆفیان دەکرد، کە ببێتە جێنشینی ستالین و سەرنجی خۆیان لەسەر ئەو چڕدەکردەوە. بەڵام لاڤرنتی. پ. بێریاو خرۆشیف ئەوانیش لەو مەیدانەدا داواکار بوون. بێریا سەرۆکی وەزارەتی ئاسایشی ناوخۆی سۆڤێت لە ساڵی ١٩٥٣ بە ماوەیەکی کەم پاش مردنی ستالین لادرا و ئەمە ئەو کاتە بوو، کە ئاشکرا بوو پیلانێکی بە مەبەستی کودەتاو بەدەستهێنانی دەسەڵات بۆ مەبەستی خۆی ئەنجامداوە. هەموو رابەرانی پلە بەرزی حیزب فەرمانی دەستگیرکردن و لە سێدارەدانی ئەویاندا.

لە ناوچوونی بێریا دەرفەتیدا بە حیزب کۆنترۆڵی پۆلیسی نهێنی بگرێتە دەست خۆی کە لەو زەمانەدا بە ئێم. جی. بی {MGB} ناودەبرا. (پۆلیسی نهێنی ناوی جۆربە جۆری هەبووە: چەکا یان وچکا لە سەردەمی لینین، جی. پی. ئۆ و پاشان ئو. ج. پی. ئو و پاشان ئێن. کا. و. د. لە ساڵی ١٩٥٤ پۆلیسی نهێنی جارێکی تر نوێکرایەوەو بوو بە کا. جی. بی) لە سێدارەدانی بێریا گرنگ بوو، چونکە ئەو بە ناونیشانی سەرۆکی دەزگایەکی بەهێز و نائاسایی، دەیتوانی دەستێوەردان لە ژیان و چارەنووسی کەسانی ناوەوەی حیزب، لەوانەش رابەرانی پلەبەرزدا بکا.

***مەسەلەی بێریا***

*مارك فرانكلند لە زمانی خرۆشیفەوە کۆتایی کاری بێریا ئاوا دەگێڕێتەوە:*

*لە ساڵی ١٩٥٦، {خرۆشیف} بە سیاسەتوانی دەرەوەی راگەیاند لەو کۆبوونەوەیەدا کە کۆبوونەوەیەکی تایبەتی بوو بۆ ماوەی چوار کاتژمێر لێکۆڵینەوە لەگەڵ بێریادا لە بارەی نەخشەکانی لە بارەی کودەتاوە بەڕێوەچوو. پاش ئەوە بێریا ئازادکرا. لە حاڵێکدا کە هاوسەنگەرانی باس و خواسی ئەوەیان بوو کە چ دەرباری ئەو دەبێ بکرێ. خرۆشیف رایگەیاند، وێڕای ئەوە کە شایەتی تەواو لە رووی قەزاییەوە بوونی نەبوو، هەمووان بەو بەرەنجامە گەیشتبوون، تاوانبارە و ئەمەش لەو مەحاڵانە بوو کە ئەو بەرەڵا بکەین و بڕوا. بەو پێودانگە، هەمووان بەکۆی دەنگ گەیشتینە ئەو ئەنجامە کە دەستپێشکەری راست بۆ بەرگریی لە شۆڕش ئەوەیە، زووبەزوو بێریا گوللەباران بکەین. ئێمە ئەو بڕیارەمان وەرگرت، و دەستبەجێ پیادە کرا.*







لە چەپەوە بۆ ڕاست: شیپلۆف مولوتۆف و مالینکۆف لە کابینەدا کەمێك پێش ڕووخانیان

بە نەمانی بێریاو کەمبوونەوەی نفوزی مولوتۆف، شەڕی دەسەڵات لە نێوان خرۆشیف و مالینکۆفدا بوو و بنەمای شەڕەکەش ئابووری بوو. مالینکۆف دەیویست سەرچاوەکانی وڵات بۆ بەرهەمهێنانی کاڵای پێویستی زیاتر بەکاربهێنێ تا بتوانێ ئەو کەم و کوڕییە رابردوو درێژانەی کە لە زەمانی لینینەوە لە سەردەمی دەسەڵات سەپاندنی کۆمۆنیزمەوە یەخەی وڵاتی گرتبوو، نەهێڵێ. لە لایەکەی دیکەوە، خرۆشیف حەزی دەکرد سیاسەتی ستالینی لە زەمینەی بەکاربردنی زۆربەی سەرچاوەکانی وڵات لە پێناوی پیشەسازییە قورسەکان و سوپادا، درێژە پێبدا.

لە سەرەتادا، هەوڵی مالینکۆف لە ڕێگای زیادکردنی کاڵاکانی بەکاربردنەوە، زۆرترین پشتیوانی لە لایەن رابەرانی سۆڤێتییەوە بەخۆوە بینی. چونکە ئەو رابەرانە ترسی ئەوەیان هەبوو، کەموکوڕییەکان ببێتە هۆکاری نائارامی. خرۆشیف لە کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیستدا توانی تا ئەندازەیەکی پێویست پشتیوانی ئەندامانی کۆمیتە بۆ خۆی رابکێشێ تاکو سیاسەتەکانی مالینکۆف پێچەوانە بکاتەوە. لە هەمانکاتدا، کۆمیتەی ناوەندی مالینکۆفی ناچارکرد تا لە پلەی سەرکەوتوی خۆی بە ناونیشانی سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران، دەست لە کارکێشانەوە پێشکەش بکا. نیکۆلای بوولگانین، هاوپەیمانی خرۆشیف و لە کارگوزارانی کۆنی چکا، بووە جێنشینی مالینکۆف. ئەو لە سیاسەتی ئابووریدا لێهاتوو بوو. ئەم ئاڵوگۆڕە، کۆنترۆڵی حکوومەتی دایە دەست خرۆشیف. گەرچی هەرگیز بەو دەسەڵاتە بێ چەندو چوونەی ستالین نەگەیشت. خرۆشیف لە هەمانکاتدا ئارەزووی دەکرد خۆی لە شێوازی حوکمی تیرۆریستی ستالین دووربخاتەوە، بەو ڕەنگ و ڕێیە، کۆمەڵە چالاکییەکی لە دژی "ستالین سڕینەوە" دەستپێکرد.



## ستالین سڕینەوە

خەڵکی سۆڤێت و تەنانەت رابەرانی پلەبەرزی حیزب، لە ژێر حکوومەتی دیکتاتۆری ستالین زوڵمێکی ترسناکیان دیبوو. رابەرانی حیزب گەرچی لە ژێر گوشارێکی توندا نەبوون، بەڵام هەمیشە لە ترسی دەستگیرکردن بە تۆمەتی پوچ و نامەنتیقی، پاش ئەوەش ئەشکەنجەدان،دادگای رووکەشییانەو لە سێدارەدان ژیانیان دەبردە سەر. پاش مردنی ئەو رابەرە دڵڕەقە، خرۆشیف هەوڵیدا ئەو گرژییانە خاوبکاتەوە و ئەمەش لە ڕێگای پیادەکردنی زنجیرەیەك گۆڕانکاری حسێب بۆکراو بە ناوی ستالین سڕینەوەوە بوو.

لە قۆناغەکانی بەرایی ستالین سڕینەوەدا ئەو ئازادییە درا بە هاوڵاتیان لە ناوەوەی وڵاتدا (نەك لە دەرەوە) بە ئازادی سەفەر بکەن. هونەرمەندان و نووسەرانیش ئازادییەکی زیاتریان درایە تا بەرهەمەکانی خۆیان بخەنەڕوو. هەزاران زیندانی لە کۆلاکەکان ئازادکران. ئەو جێگایانە کۆمەڵە ئوردوگایەك بوون لە سیبریا و جێگای تر کە ژیان لەوێدا هەلومەرجێکی یەکجار سەختی هەبوو. لە ئاکامی ئەو پاشەکشێیە لە سیاسەتەکانی ستالینی، لە ساڵی ١٩٥٥ خرۆشیف پێگەی رابەری خۆی مەحکەم کرد، ستالین سڕینەوە قازانجگەلێکی بەرچاوی هێنایە بەرهەم. بەو حاڵەوە، روبیرت دانیل دەڵێ کە: "هیچ کام لە چاکسازییەکانی خرۆشیف گۆڕانێکی سەرەکی لە ڕەوتی دەزگایی و دەسەڵاتی ستالین پێك نەهێنا"[٣٧].

بەڵام قۆناغی دوایی ستالین سڕینەوە دنیای ئازاد و هەروەها خودی خەڵکانی بلۆکی کۆمۆنیستیشی هێنایە سەرسامییەوە. خرۆشیف لە گوتارێکدا لە بیستەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤێتی لە بەرواری شوباتی ١٩٥٦دا ستالینی بە "ستەمباری خوێنخۆر" ناو برد. لەو دەربڕینە سەرسامهێنەرانەدا کە بە ناوی "لێدوانی نهێنی" ناسرا، خرۆشیف ستالینی بە هۆی زەرەرو زیانی قورسی سۆڤێت لە میانی جەنگی دووەمی جیهانی سەرکۆنەکرد. بە هەق دەریخست کە ئەو پاکتاوکاریانەی کە لە سێدارەدانی هەزاران ئەفسەری سوپای بەدوو خۆیدا هێنا، رۆڵێکی بنەڕەتی لەو زەرەرو زیانەدا هەبووە، بەڵام لەمەڕ بەشداری خۆی لە پیادەکردنی ئەو پاکتاوکاریانە، قسەیەکی لە بارەوە نەکرد.

"لێدوانی نهێنی" لە دەرەوەی یەکێتیی سۆڤێت بە جۆرێکی بەرین بڵاوبۆوە، لە چاوی هاوڵاتیانی ئاسایی سۆڤێت بە نهێنی هێڵدرایەوە. قۆناغێکی نوێ چاوپۆشی لێکراو تێپەڕی، لەو لێدوانەدا بەلای کەمەوە لە ئاستی قسەکردندا راگەیەنرا بوو، ئازادی ئاگاداری و زانیاری نەدەگرتە خۆی، تەنیا کەسانێك لە نێو خاکی سۆڤێتدا، دەقی تەواوی لێدوانەکەیان بەرگوێ

کەوت، نوێنەرانی کۆنگرەی حیزب بوون- ئەو کۆنگرەیەی کە لێدوانەکە تێیدا بەڕێوەچوو- و هەروەها بەشێك لە ئەنجوومەنە ناوچەییەکان بوون، کە ئەم لێدوانەیان بـە دەنگێکـی بـەرز، هەڵبەتە لە پشت دەرگاداخراوەکانەوە، بۆ خوێندرایەوە.

---

***هێشتنەوەی کۆنترۆڵی حیزبی***

*مەبەست لە ستالین سڕینەوە بڵاوکردنەوەو ڕەسێن دان بەدیموکراسـی نـەبوو. فیـدرو بۆرلاتـسکی، راوێژکاری سەرۆك وەزیران، باوەڕی سۆڤێتییەکان بە فەرمانڕەوایانی موتڵەق بەم ئاوایە شـی دەکاتـەوە (لە کتێبی خرۆشیف، نووسینی مارك فرانکلند):*

*ستالین بیری لینینی لە بـارەی ڕێنـوێنیکردنی حیزبـی کۆمۆنیـست بـە شـێوەیەك کـە کـونترۆڵی موتڵەقی حیزب هەموو لایەنەکانی ژیانی سۆڤێتییەکان ئاراستە بکا، پەرەپێـدا. و خرۆشـیفیش هـەر لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە دەبێ حیزب هەمان کۆنترۆڵی موتڵەقی بەسەر ژیـانی سـۆڤێتەوە هـەبێ کـە ستالین بەخودی خۆی پیادەی دەکرد... لەم ڕووەوە پرسی بنەڕەتیی کە جێگا بایەخی خرۆشیف بوون لە (لێدوانی نهێنی)دا، ئەوەبوو، بڵێ سەرەڕای دانپێدانان بە هەڵەکانی رابـردوو، نابـێ دەسـت بـۆ هـیچ کارێك ببرێ لە دەسەڵاتی حیزب کەل بکا.*

---

لە هەمان حاڵدا، خرۆشـیف سـتالینی بـە هێنانەکایـەی جۆرێـك "کەسـایەتی پەرسـتی" تۆمەتبار کرد. لەو کەسایەتی پەرستییەدا، بۆ پلەی پاشایەکی قارەمانی لـە هەڵـەکردن بـەدەر بەرزکردبۆوە. لە حاڵێکدا لە جیاتی ئەوەی چواردەوری خۆی بە راوێژکارانی سیاسی دەسـەڵاتدار بگرێ، خەڵکێکی (بەڵێ قوربان)ی لە دەوری خۆی کۆکردبۆوە. کاتێك ستالین مرد، دڵـسۆزان و کەسایەتی پەرستان بینییان، قارەمانی ئەوان لـە مـەزاری لیـنین، مـەزاری سـۆڤێتی، نێـژرا. خرۆشیف کە پێشان لە دەستەی ستایشکارانی ستالین بوو، پشتیوانی لە بیروبۆچوونی رابـەرانی تری هاوسەنگەری خۆی کرد لە بـارەی گواسـتنەوەی تـابووتی سـتالین بـۆ جێگایـەکی دیکـە. ئەوەبوو تابووتی ئەویان لە جێگای شانازی واری پەنا لیـنین هـەڵگرت و بـۆ کـرملین، وارگـەی فراوانی حکومەت، لە مۆسکۆ، گوازرایـەوە. هـەمان دەستپێـشکەری بەڕواڵـەت ناچـیز، لـە راستیدا ڕووداوی ڕانانێکی گەورە بوو، ستالین سڕینەوەی زیاتری پیشان دەدا.



## سیاسەتی دەرەوەی خرۆشیف

لە حاڵێکدا سیاسەتی سـتالین سـڕینەوە لـەناو نیـشتیماندا لـە دۆخـی پیادەکردنـدا بـوو، خرۆشیف هەوڵیدا گرژییەکانی دەرەوە کەم بکاتەوە. جەنگی سـارد درێـژەی هـەبوو، خرۆشـیف کۆمەڵە هەنگاوێکی هەڵێنا، وڵاتانی رۆژئاوا بـەو شـێوەیە لێکیاندایـەوە، کـە سـەرکردایەتی سۆڤێت ئارەزوو دەکا دەرەتانی پەیوەندی باشتر لەگەڵ دراوسێکانیدا بەدەست بهێنێ. خرۆشیف ئەو ژمارە سەربازەی لە زەمانی جەنگی دووەمی جیهانی لە نەمسا مابوونەوە، گەڕانـدەوە بـۆ سۆڤێت و پێشنیاری کرد کۆنفراسێکی بالاّ بە ئامادەبوونی سەرانی وڵاتانی رۆژئاوا لە بـەرواری ١٩٥٥ لە ژنێف (سویس لاند) ببەسترێ تا لە بارەی یەکێتی ئـەڵمانیا، چـەکداماڵین و هـەموو پرسەکانی پەیوەست بە هەردوو بلۆك باس و گوت و بێژ بەڕێوەبچێت.



**شۆڕشگێڕانی هەنگاریا بەسەر تانکێکەوەن کە لە هێزەکانی سۆڤێتی گرتویانەو لە بەرامبەر پەرلەمان لە بودابست ئالای خۆیان دەشەکێننەوە**

لە کۆنفراسی سەرۆکەکاندا، دوایت ئایزنهاوەر سەرۆك کۆماری ئەوکاتی ئەمریکا پێشنیاری ڕێکەوتننامەی "ئاسمانی کراوە"ی راگەیاند، کە بەپێی ئەوە، ئەمریکاو سۆڤێت ڕێگـەیان دەدا هەرکام لە لایەنی بەرامبەر مافی فڕینی بەسەر ئاسمانی ئەو وڵاتەدا هەبێ تا بتوانـێ لـە بـارەی ئاسانکاری سەربازی هەردوو زلهێز پشکنینی هەوایی ئەنجام بدا. خرۆشیف بەو پێشنیارە نالێـك بوو، پاش چوار ساڵ پاشتر کە سەفەری بـۆ ئـەمریکا کـرد، نییەتباشـی خـۆی پیـشاندا، لـەو

سەفەرەدا ئەو سەردانی کارگەیەکی لە لۆس ئەنجلس و کێڵگەیەك لە ئایوو بارەگای ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، کرد.

هەروەها خرۆشیف لە ساڵی ١٩٥٥ پەیمانی وارشۆی بنیات نا. لەو پەیمانەدا وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات بەڵێنی ئەوەیان دەدا کە لە یەك خولی بیست ساڵەدا "دۆستایەتی، هاوکاری، کۆمەکی هاوبەش" بگرنە بەر. پەیمانی وارشۆ یەکێتی وڵاتانی بلوکی ڕۆژهەڵات بوو دژ بەوەی کە سۆڤێت بە هەڕەشەی ناتۆ (ڕێکخراوی پەیمانی ئەتلانتیکی باکوور)ی دەزانی. ناتۆ پەیمانی بەرگری هاوبەشی وڵاتانی ڕۆژئاوا لە پاش جەنگ بوو. باڵا دەسەڵاتیی سۆڤێت بەسەر وڵاتانی پەیمانی وارشۆ، بەشێك لە ستراتیژیی درێژخایەنی هێنانەدی ناوچەیەکی بێلایەن بوو.

***خرۆشیف دەڕەنجێ***

*لە ساڵی ١٩٥٩ خرۆشیف بە ڕەسمی بانگهێشت کرا تا سەردانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکا. ئەو نیگەران بوو لەوەی، بە هۆی گرژییەکانی ڕابردوو لە نێوان ئەمریکا و سۆڤێت ڕەفتارێکی شایستەی لەگەڵدا نەکرێ. لە کتێبی خرۆشیف بە ناوی دوایین پەیمان ئەو نیگەرانی خۆی بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە:*

*کاتێك لە لایەن باڵیۆزخانەی خۆمان لە واشینگتۆن ئاگادار کرامەوە کە چەند ڕۆژێکی بەرنامەمان تەرخانە بۆ ئەوەی لە کامپ دیڤید لەگەڵ سەرۆك کۆماردا دیدەنی بکەم، من هەر لە بنەڕەتدا نەمدەتوانی تێبگەم کە کامپ دیڤید چ جۆرە شتێکە. ناچار بۆ وەزارەتی دەرەوەی خۆمان گەڕامەوەو لەو بووارەدا چەند پرسیارێکم کرد. ئەوان گوتیان، ئێمەش لەو شتە بێ ئاگاین... یەکێك لەو بەڵگانەی کە من بەو بابەتە بەدگومانیم هەبوو ئەوەبوو کە هاتەوە بیرم لە یەکەمین ساڵەکانی پاش شۆڕش، کاتێك یەکەمین پەیوەندی لەگەڵ جیهانی بورژوازی دامەزرا، کۆمیتەیەك لە یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤێت بۆ کۆنفرانسێك بانگهێشت کرابوو لە جێگایەك بە ناوی دورگەکانی پرنسی. لە ڕۆژنامەکاندا هاتبوو، کە سەگی خوێڕی دەنێرنە ئەو دورگانە بۆ ئەوەی بمرن بە گوزارەیەکی دیکە، بە بانگهێشت کردنی ئەو کۆمیتەیەی سۆڤێت بۆ ئەو جێگەیە سووکایەتییان بەوان کردبوو. لەو ڕۆژانەدا، سەرمایەداران بچووکترین دەرفەتیان بۆ ئازاردان یان ڕەنجاندنی یەکێتیی سۆڤێت لە دەست نەدەدا. ترسی من لەوەبوو کە ڕەنگە ئەم کامپ دیڤیدە جێگایەکی هاوچوونی هەمان ئەو جێیە بێ. جێگایەك بێ بۆ چاودێریی خەڵکانێك کە جێگای متمانە نین.*





*نیکیتا خرۆشیف، سەرۆك وەزیرانی سۆڤێت لە دەمی گەڕانی سێزدە ڕۆژەی ئەمریکا.*

وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا کەوتبوونە نێوان یەکێتیی سۆڤێت و دوژمنەکانییەوە و خرۆشیف و هاودەستەکانی لە بەرامبەر هەر دەستپێشکەرییەك لەلایەن ئەندامانی پەیمانی وارشۆوە بە مەبەستی جیابوونەوە لە سۆڤێت، هەستیار بوون.

لەسەر ئەو بنەمایە کاتێك لە ساڵی ١٩٥٦دا پۆلۆنییەکان و هەنگارییەکان بەدگۆییەکانی بەرامبەر ستالینیان بە نیشانەیەکی نەرم و نیانی دەسەڵاتی سۆڤێت بەسەر حکوومەتەکانی خۆیاندا لێکدایەوە، خرۆشیف بەتوندی نیگەران بوو. پۆلۆنییەکان وایان بەڵگە دەهێنایەوە کە لە سۆنگایی ستالین سڕینەوەوە ئەم دەرفەتەیان بۆ هاتۆتە پێش کە ناڕەحەتییەکانی خۆیان بە دەنگی بەرز ڕابگەیەنن. ئەوان دەستیاندایە شۆڕش وداخوازی چاکسازییان لە شێوەی حکوومەت، ژیانێکی باشتر، هەلومەرجی گونجاوی کارو مافە مەدەنییەکانیان خستەڕوو. خرۆشیف کۆمیتەیەکی ڕەوانەی پۆلۆنیا کرد تاکو پۆلۆنییەکان تێبگەیەنن، شۆڕش کردن دژی موسکۆ، لە ڕێگەی دەستدرێژیی سەربازییەوە سەرکوتدەکرێ. ڕژێم بەرقەرار کراو حکوومەتی پۆلۆنیا جارێکی تریش پاشکۆیەتی بۆ یەکێتیی سۆڤێت دەست پێکردەوە.

شۆڕش گەلێکی توندتری دیکە لە هەمان ساڵدا لە هەنگاریا ڕوویدا. چەند ڕۆژێك پاش دیداری کۆمیتەی نوێنەرایەتی خرۆشیف لە پۆلۆنیا، قوتابیانی زانکۆی هەنگاریا لە بوودابست کۆمەڵە خۆپیشاندانێکیان بەڕێخست وداوای حکوومەتی نوێیان کرد. لە ڕێگەی دامرکاندنەوەی

ڕاپەڕین سێ هەزار کەس کوژران و دووسەد هەزار کەس لە وڵات هەڵاتن کە سەرەنجام بۆ ئەمریکا کۆچیان کرد. لە ئەنجامی ڕاپەڕینی هەنگارییەکان، یەکێتیی سۆڤێت سەرنجی خۆی بۆ ستراتیژی بەرگریی سەربازیی و هەروەها پەیوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوا پەرەپێدا.

## زیادکردنی چەکەکانی سۆڤێت

ڕاپەڕینی هەنگارییەکان، پەیوەندییەکانی سۆڤێتی لەگەڵ بەهێزترین دوژمنی خۆی لە جەنگی سارددا، مانای ئەمریکا، ساردتر کرد. لە مانگی ئابی ١٩٥٧، یەکێتیی سۆڤێت بە تاقیکردنەوەی یەك موشەکی بالیستیکی کیشوەربڕ، ئەم گرژییانەی زیاتر کرد و هەروەها لە چواری تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا یەکەمین مانگی دەستکردی بە ناوی سیپۆنتیك بەرەو بۆشایی ئاسمان هەڵدا. هەڵدانی سیپۆنتیك بۆ ئاسمان خاڵی وەرچەرخانێکی گرنگ بوو. بەڵام سەرمایەگوزاری زۆری دەوڵەتی سۆڤێتی لە زەمینەی وزەی ئەتۆمی، دروستکردنی ڕۆکێت و موشەك و سەفەری بۆشایی، دژایەتییەکی توندی لەگەڵ ئاستی ژیانی نزم و نالەباری خەڵکدا هەبوو. لە شارەکاندا هێشتا کەمی خانوو و کەرەسەی بنیاتنان هەبوو و بەکاربەرانی کاڵا لە فرۆشگا دەوڵەتییەکاندا بەزۆری پێشانگاکانیان کەم و زۆر بە بەتاڵی دەبینی.

کاتێك سۆڤێتییەکان فڕۆکەیەکی سیخوڕیی ئەمریکایان، کە لە قەڵەمڕەوی ڕوسیادا دەفڕی، خستەخوارێ، گرژییەکان زیاتر کڵپەیان ستاند و کۆنفراسێك لە ئاستی سەرۆکەکان، کە بڕیار وابوو لە ساڵی ١٩٦٠ لە پاریس پێکبهێنرێ، هەڵوەشایەوە.

پاش ئەوەی جۆن کەنەدی لە ساڵی ١٩٦٠ بۆ سەرۆك کۆماری ئەمریکا هەڵبژێردرا، لە مانگی حوزەیرانی ١٩٦١ لە شاری ڤیەننا لەگەڵ خرۆشیفدا دیدەنی کرد تا لە بارەی داهاتووی وڵاتی دابەشکراوی ئەڵمانیا باس و لێکۆڵینەوە بکەن. ئەمە لە حاڵێکدا بوو کە ئەڵمانیا، بە پێی مەرجەکانی خۆبەدەستەوەدانی ئەو وڵاتە لە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی لە ساڵی ١٩٤٥، بە دەستی هاوپەیمانان بەڕێوە دەچوو. خرۆشیف، دەیویست هێزەکانی ڕۆژئاوا لە مەیدان بکاتە دەرێ، هەڕەشەی کرد کە لەگەڵ ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتدا پەیمان ئیمزا دەکا و ئەمەش شتێك بوو، یەکێتی ئەڵمانیای دژوارتر دەکرد. یان گری لە شیکردنەوەی ئەو ڕووداوەدا نووسیویە: "خرۆشیف لە بارەی نەخشەی کەنەدی و ئەو پاڵپشتەی کە لە هەقی ئەو بەرهەڵستییەی لە بەرامبەر هەڕەشەیەکی ئاوادا، لە ڕۆژئاوا بە دەستی دەهێنا،داوەرییەکی نادروستی هەڵێنجا"(٣٩). هێزەکانی بلۆکی ڕۆژئاوا بەدامەزراندنی ڕێکخراوی سەربازی ناتۆ



پەرچەکرداریان نیشاندا. سۆڤێت بە بنیاتنانی دیوارێك کە بەرلینی ڕۆژهەڵات لە بەرلینی ڕۆژئاوا جیادەکاتەوە، دەستیدایە ڕوبەڕووبوونەوە. ئەم دیوارە پێشگیریی لە هەڵاتنی پەنابەران لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ئەڵمانیای ڕۆژئاوا دەکرد. ڕووبەڕووبوونەیەکی جیدی تر لە نێوان ئەمریکا و سۆڤێت لە ساڵی داهاتوو لە کوبا ڕوویدا.

## قەیرانی موشەکەکانی کوبا

کاتێك کە فیدڵ کاسترۆ لە ساڵی ١٩٥٩ لەدامەزراندنی حکوومەتێکی کومۆنیستی لە کوبا سەرکەوتوو بوو. خرۆشیف بەم مەسەلەیە خۆشحاڵ و هیوادار بوو لە ڕێگەی بەکارهێنانی کۆمەگ و نفووزی سۆڤێت لە دورگەکانی دەریای کاریبی، جووڵانەوەی کۆمۆنیستی لە سەرتاسەری ئەمریکای لاتیندا ڕاپەڕینێ. سۆڤێت بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی ئاوا، یەك زنجیرە پایەگای لە کوبادامەزراند تا بتوانێ بۆ هاویشتنی موشەك بەرەو نیشانەگرتن لە شارەکانی ئەمریکا کەڵکی لێ وەربگرێ.




**پێگەکانی موشەکە بالیستییەکانی ناوەڕاست مەودا لە کوبا**

کاتێك لە تشرینی یەکەمی ١٩٦٢ ئەم هەڕەشانە بە هەقی ئاسایشی ئەمریکا ئاشکرابوون، کەنەدی، سەرۆك کۆماری ئەمریکا، فەرمانیدا ڕێگەی هەموو ئەو کەشتیانە بگرن کە بەرەو

کوبا کاڵایان هەڵگرتووە کە ئەگەری ئەوە هەبوو کەرەسەی سەربازییان هەڵگرتبێ. کاتێك فەرمانی ڕێگا بەستن دەرچوو، چەندین کەشتی لە بلۆکی سۆڤێتییەوە کە بەرەو کوبا بەڕێوە بوو، لە جیاتی ڕووبەڕووبوونەوەو ململانێی سەربازی لەگەڵ ئەمریکا، لە نیوەی ڕێگا گەڕانەوەو بەرەو بەندەرەکانی خۆیان ڕێگایان گرتەبەر. لە هەمان کاتدا کەنەدی ڕایگەیاند؛ هەر هێرشێك لە لایەن کوباوە بۆ سەر هەر وڵاتێکی نیوەگۆی ڕۆژئاوا، وەك هێرشی ڕاستەوخۆی سۆڤێت بۆ سەر ئەمریکا چاوی لێدەکرێ.

پاش ئەوە، خرۆشیف بە ناردنی نامەیەك پێشنیاری سازش کردن لەگەڵ کەنەدیدا دەکا: ئەمریکا موشەکە دامەزراوەکانی خۆی لە تورکیا کە سۆڤێت ئەوان بە هەڕەشەیەك بۆ سەرخۆی دەزانێ، هەڵبگرێتەوە، لەبەرامبەردا، سۆڤێتیش چەکەکانی خۆی لە کوبا بگێڕێتەوە. وێڕای ئەوە کە موشەکەکانی تورکیا بەجێمابوون و بەرواریان بەسەرچوو بوو، کەنەدی ئەمەی وەکو بەشێکی مامەڵەکە قبووڵ نەکرد. وێڕای ئەمەش خرۆشیف تەسلیم بوو فەرمانیدا دەستبەجێ پێگە موشەکییەکانی کوبا هەڵبگرنەوە. هەموو ڕابەرانی کۆمۆنیست ئەم جووڵانەوەیان بەجۆرێك لە خیانەت کردن بە سۆسیالیزم زانی. دەوڵەتی چینیش ڕەخنەی لەم کارە گرت، هەروەکو هەموو بەرپرسانی حیزبی خرۆشیف خۆشی ڕەخنەیان لەم کارە گرت، زەمانێك لە ساڵی ١٩٤٩دا کە کۆمۆنیستەکان سەرتاسەری خاکی بنەڕەتی چینیان گرتە دەست خۆیان، پەیوەندییەکانی چین و سۆڤێت بەردەوام لە کێشمەکێشمدابوو و ئەو سووکایەتییەی کە وا وێنادەکرا خرۆشیف هۆکاری بووە، دووبارە پەرەی بە ئاڵۆزیی پەیوەندییەکانی ئەم دوو وڵاتەدا.



**جون. ئیف. کەنەدی سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە ئاخاوتنی تەلەفزیونی خۆیدا قسە بۆ خەڵکی وڵاتەکەی دەکا و باس لە قەیرانی موشەکەکانی کوبا بڵاودەکاتەوە**



## پەیوەندییەکانی چین و سۆڤێت

گەورەترین کێشەی خرۆشیف لە پەیوەندی لەگەڵ چیندا ئەوەبوو، یەکێتیی سۆڤێت دەیویست پەیوەندییەکی ئاشتیانەی زۆرتری لەگەڵ بلۆکی ڕۆژئاوادا هەبێ، لە حاڵێکدا کە چین، کە حکوومەتێکی (مارکسیستی) سەرەڕۆی هەبوو، دەیویست لە نێوان بلۆکی ڕۆژئاواو بلۆکی کۆمۆنیستەکاندا ڕووبەڕووبوونەوەی هەرچی زۆرتر بێتەئاراوە. (ماو) دیکتاتۆری چین، لە سەردەمی خرۆشیف پشتیوانی ئەمریکای لە دوورگەی تایوان، کە بە چینی میللی ناودەبرا، وەك هەڕەشەیەکی جیدی لە دژی حکوومەتی چینی کۆمۆنیستی لێکدەدایەوە. (ماو) لەو باوەڕەدا بوو، هەوڵەکانی خرۆشیف بۆ بەرقەرارکردنی پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ ئەمریکا، هەڕەشەی ئەمریکا لە بەرامبەر خاکی بنەڕەتیی چیندا توندتر دەکا.

خرۆشیف هەوڵیدا بە پێشنیاری هێنانەکایەی سوپەری ئەتۆمی بۆ پشتیوانی لە چین لە حاڵی هێرشکردنی دوژمن، هەستی زەرەرمەند بوونی چینییەکان کەم بکاتەوە. بەڵام (ماو) وای بە پەسەند زانی بەرگری کردن لە خۆی بە ئەستۆی خۆیەوە بگرێ، و خرۆشیفی خستە ژێر گوشارەوە بۆ ئەوەی بۆ بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی تەکنۆلۆژی پێویست بخاتە بەردەستیەوە. سەرەتا خرۆشیف بە شێوەیەکی نهێنی ئەو پێشنیارەی قبووڵ کرد، بەڵام لە ترسی ئەوەی نەوەکو ڕووبەڕووبوونەوەی بەینی ئەمریکاو چین، یەخەی یەکێتیی سۆڤێتیش بگرێتەوە، لە ساڵی ١٩٥٩ لەو بەڵێنەی پاشگەزبۆوە. خرۆشیف لە بیرەوەرییەکانیدا ڕابردووی بەخشندەیی سۆڤێت بەرامبەر بە چین ئاوا ڕاڤە دەکات: "بەر لە ئاڵۆزبوونی پەیوەندییەکانی ئێمە، هەرچی کە چینییەکان داوایان لێکردین خستمانە بەردەستیانەوە. ئێمە هیچ نهێنییەکمان لەوان نەشاردەوە. پسپۆڕانی ئەتۆمی ئێمە لەگەڵ ئەندازیاران و نەخشەسازانی ئەوان، کە سەرقاڵی دروست کردنی بۆمبای ئەتۆمیی بوون، هاوکارییان کرد. زاناکانی ئەوانمان لە تاقیگاکانی خۆماندا فێرکرد"[٤٠].

سەرەڕای ئەوەی پەیوەندییەکانی چین و سۆڤێت درزی تێکەوت، خرۆشیف ئارەزووی دەکرد لە ڕێگەی ئامادەبوونی کۆمەگکی تەکنیکی وێرا بە پڕوپاگەندە، کۆمۆنیزم لە وڵاتانی پەرەئەستێن لە ئاسیا و ئەفریقیا پەرەپێبدا.

## یارمەتییەکانی سۆڤێت بۆ ئەفریقیاو هیند

ئەو ماوە زەمەنییەی نێوان مردنی ستالین لە ساڵی ١٩٥٣و پەناگیرکردنی زۆرەملێی خرۆشیف لە ساڵی ١٩٦٤ لە جیهانی سێیەمدا قۆناغی سەبەخۆیی و چالاکی دژە ئیستعماری بوو. لە وڵاتانی کۆلۆنی پێشووی ئەوروپاییەکان لە ئەفریقیا، ئاسیاو ئیندونیزیا هەستی نەتەوەپەرستی پەرەی گرت. خرۆشیف ئەم نەتەوە تازە سەرپێکەوتوانە، ئەو تازە هاتوانە بۆ نێو مەیدانی سیاسەتی نێو نەتەوایەتی بە مەیدانێکی گونجاو بۆدامەزراندنی کۆمەڵگاگەلی کۆمۆنیستی دانا.

بۆ نموونە هیندستان لە ساڵی ١٩٤٧ سەربەخۆیی خۆی لە بەریتانیا بەدەستهێنابوو. بەڵام لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٥٠دا بۆ بەدەستهێنانی سەقامگیریی سیاسی و ئابووری هەوڵی دەدا. لە ساڵی ١٩٥٥ خرۆشیف دیدەنیی هیندستانی کردو بەڵێنی یارمەتیگەلێکی بنەڕەتیی ئابووریدا. ئاستی ئەو یارمەتییانە لە ساڵی ١٩٦٠دا لە ئاستی ئەو یارمەتییانە تێپەڕی کە سۆڤێت بە چینی دابوو. یەکێتیی سۆڤێت ڕەزامەندی لەسەر ئەوەشدا فڕۆکەی شەڕکەری جتی میك ٢١ی خۆی لە هیندستان بەرهەمبهێنێ. ئەمە جۆرێك نمایشی بێ جێ بوو کە پاشان بووە بایسی توندکردنی گرژییەکانی نێوان چین و سۆڤێت.

خرۆشیف لە ئەفریقیا چەندین نەخشەی نمایشکارانەی لە وڵاتانی تازە سەربەخۆ بوو، مانای کۆلۆنییەکانی پێشوو، پیادەکرد. ئەم وڵاتانە بریتی بوون لە کۆنکو، گینەو کینیا. ئەو بە ئومێدی ئەوەبوو کۆمۆنیستەکان دەسەڵات باڵایی بەسەر ئەو وڵاتانەدا پەیدا بکەن. بەڵام ئەو نەخشە نمایشکارییانە بەشکست کۆتاییان هات. بەرنامەداڕێژانی سۆڤێت پاشکەوتویی تەکنیکی و هونەری وڵاتانی کڕیاری خۆیان بە نادیدە گرتبوو. ئەوان لە بیریان چووبوو کە هێزی سەربازی تەواو لە ژێر دەستی وڵاتانی دەستنیشانکراوی خۆیاندادابنێن تابتوانن لە بەرامبەر رکابەرانی دەسەڵاتدا بەرهەڵستی بکەن.

هاوکارانی خرۆشیف لە سەرکردایەتی سۆڤێتدا، ئەویان لە سەرینی تێکشانەکانییەوە- ڕووداوە ناپەسەندەکانی ئەفریقیا، بێ توانایی لە هێشتنەوەی هێزی سەربازی لە کوباو دوورکەوتنەوە لە چین- و سەرباری ئەوەی کە لە بەهێزکردنی پێکەوەژیان لەگەڵ ئەمریکادا داهێنانی ئەرێتی لە خۆی نیشاندابوو، لە مەیدانی سیاسەتی دەرەوەدا بە شکستخواردوو لە قەڵەمدا. داهێنانەکانی ئەو لە بواری چاك کردنی کشتوکاڵیشدا تەنیا کەمێك باشتر دەهاتە بەرچاو.



## هەوڵدان بۆ چاك کردن: بەرنامەی خاکە بەیارەکان

خرۆشیف لە ساڵی ١٩٥٤، لیۆنید برژنیف، کە دەست پەروەردەی خۆی بوو، بۆ سیبریاو ئاسیای ناوەڕاست نارد. برژنیف، تەکنوکراتێکی کارامە بوو و لە هەمان کاتیشدا کۆنە سەربازێکی نەبەردی نەهێشتنی کۆلاکەکان بوو، بەناونیشانی دوورخراوەیەك چووە ئەو ناوچەیە. ئەو راسپێردرابوو، بەرنامەیەك لەو هەرێمانەدا جێبەجێ بکا، بەرنامەکەش ئەوە بوو خرۆشیف بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کەمایەسی ماوەدرێژی بەروبوومی کشتوکاڵی داڕشتبوو.

ئەم نەخشە بەرزەفڕانەیە، کە بە بەرنامەی خاکە بەیارەکان ناسرا، لەداچاندنی دانەوێڵە لە زیاتر لە سەد ملیۆن جەریب[4] لەو زەوییانەی کە لە رابردوودا بەکارنەهاتبوون سەرکەوتوو بوو. هەرچەندە ئەم بەرنامەیە لە نێوان ساڵانی ١٩٥٤ تا ١٩٦٠ بە شێوەیەکی کاتی کەمایەسی دانەوێڵەی نەهێشت، بەڵام ئاستی بەرهەم بەجۆرێکی گشتی کەم بوو وسۆڤێت سەرەنجام بڕێکی زۆر دانەوێڵەی لە کەنەدا، ئوسترالیاو ئەمریکاوە دەهێنایە ناو وڵاتەوە. کۆمەڵێك بەڵگە بۆ شکستی بەرنامەی خاکە بەیارەکان هەبوو: ناردنی کرێکار بۆ ئەو هەرێمە نا ئاوەدانە کارێکی دژوار بوو: تواناکانی بارکردن و گواستنەوە بۆ گواستنەوەی بەرهەمەکانی کەم و ناتەواو بوو؛ و دواجاریش ئاوهەوای ناسازگاری پێشبینی نەکراوی هەرێمەکە بە زۆری دەبووە بایسی لە بەینبردنی بەروبوومەکان.

یەکێکی تر لە بەرنامە چاکسازییەکانی خرۆشیف لە ناوەندداڕنینی پیشەسازییەکان بوو. ئەو، دەیویست پیشەسازییەکان لە بەردەستی ناوەند بێنێتە دەرێ و بیخاتە ژێر دەسەڵاتی پسپۆڕانی ناوچەیی دوور لە مۆسکۆ.

4- جەریب: یەکەیەکی پێوانەی زەوییە لە نێوان ١٠٠٠ مەتر تا ٣٦٠٠ مەتر دووجایە. ((وەگێڕ))





***بۆچی بەرنامەکانی خاکە بەیارەکان شکستیان هێنا؟***

*نەخشەی خرۆشیف لە بارەی خاکە بەیارەکان، مانای کشتوکاڵ لە ملیۆنان جەریب لە زەوی و زارەکانی سیبریا لە پێناوی نەهێشتنی پرسی ماوەدرێژی کەمایەسی خواردەمەنی، وەك نەخشەیەکی تێکشکاو چاوی لێ کرا. قسە پڕ ماناکانی خودی خرۆشیف لە کتێبی خرۆشیف دەگێڕێتەوە: دوایین پەیمان، ئەم بابەتە ڕۆشن دەکاتەوە: ماوەیەکی درێژی خایاند تا کێشەی باروگواستنەوە چارەسەر بکرێ.دانەوێڵەی درەوکراو ماوەیەکی درێژ لە کێڵگەکاندا بەسەریەکدا کەڵەکە ببوون. ئێمە تەنانەت گونییەی تەواومان نەبوو گەنمەکانی تێبکەین، و ئینجا کامیونەکانیشمان پێویستیان بە نۆژەن کردنەوە هەبوو، جادەکان ئەوەندە خراپ بوون کە کاتی گواستنەوە بڕێکی زۆری دانەوێڵەکان بەسەر جادەکاندا دەڕژاو لە بەین دەچوون. یەکێك لەو کێشانەش هاتنەوە پێشەوە ئەوەبوو هەندێك لەو جێیانەی کە بۆ کشتوکاڵ تەرخان کرابوون، لە کاتی کارکردندا، بەیارو وشك دەرچوون. بەڵام ئەم جۆرە بەربەستانە بە زۆری چارەسەر دەکران. لە قازاخستان بە بڕێکی تەواو زەویمان هەبوو، بەو پێودانگە هەرکات پارچەیەکی بەیارمان دەدی، بەدوای جێگایەکی تردا دەگەڕاین.*

بەڵام بیروکراتەکانی حکوومەت، ئەوانەی زۆرترین برینیان دەخستە نێو پێشنیارەکانی چاکسازییەوە، توانییان ڕێگا لەو ببەستن، و لە بەرامبەردا پشتیوانییان لە بەرنامەگەلی دیکە دەکرد کە ئامانجیان هێنانە خوارەوەی خرۆشیف لە دەسەڵات بوو.

## خرۆشیف لە پیلانی لە دەسەڵات لادان ڕزگاری دەبێ

هەوڵدانەکانی خرۆشیف لە زەمینەی بەرنامەکانی ناوەندداڕنین لە ئابووری و هەروەها کەمکردنەوەی دەسەڵاتی چەند وەزیرێکی حکوومەت، لەوانە گریگوری مالنکوف و تەنانەت نیکۆلای بوولگانین کە دەستنێژی خودی خرۆشیف بوو، بووە هۆکاری ئەوەی کە نارازییەکانی لە حوزەیرانی ١٩٥٧ دەستپێشکەری لادانی ئەو بکەن. پیلانگێڕان، کە بە گروپی دژە حیزب ناوبانگیان دەرکردبوو، دەیانویست {لە لایەکەوە} خرۆشیف ناچار بکەن دەست لە کاربکێشێتەوە، و {لە لایەکی ترەوە بۆ کۆمیتەی ناوەندی، کە لایەنگرانی خرۆشیف لەوێدا زۆرینە بوون، ڕابگەیەنن کە ڕابەرەکەیان دەستی لە کار کێشاوەتەوە. خرۆشیف لە دەست لە کارکێشانەوە خۆی بواردو داوای کرد، کە لە نێو کۆمیتەی ناوەندیدا لە مبارەیەوە ڕاپرسی ئەنجام بدرێ. پاش ئەنجامدانی ڕاپرسی خرۆشیف سەرکەوتنی بەدەستهێنا. یەکێك لە ڕاوێژکارانی ئەو، بە ناوی فدور بۆرلاتسکی هەستی کەڵەکەبووی دژە خرۆشیف ئەم ئاوایە وەسف دەکا:



ڕووداوەکانی هەنگاریا، بریسکەی تەقینەوەی هەستی {کادران}ی ڕابەریی سۆڤێتی، کە لە پێشاندا کەڵەکە بوو بوو، پێکهێنا. {دەستەیەك لە ئەندامانی کۆنی حیزب کە هێشتا لە بەرامبەر ستالین وەفاداربوون، لیستێکی دوورودرێژیان لە سکاڵا دژی داهێنانەکانی خرۆشیف لە بواری سیاسەتی ناوخۆیی و دەرەوە، گەڵاڵە کردبوو و بڕیاریاندابوو کە بەیەك زەربە خرۆشیف لە پێگەی ڕابەرایەتی حیزبدابگرن[٤١].

کۆششی ئەم دەستەیە بە شکست کۆتایی هات. چونکە پیلانگێڕان پشتیوانی بەرفراوانی کۆمیتەی ناوەندی و سوپایان لە خرۆشیف لە بیر چۆبۆوە. پاش ئەوە پیلانگێڕانی لە دەستەی سەرۆکایەتی (پۆلیت بووروی پێشان)و کۆمیتەی ناوەندی بەدەرنا. لە هەمانکاتدا، پشتیوانەکانی خۆی بەرزکردەوە و لە جێگای دەرکراوانی دانان. لەوەو پاش، دەستەکانی خرۆشیف بۆ بەدواداچوونی سیاسەتەکانی، کە ئیتر بەربەستێکی لەبەردەمدا نەبوو، زیاتر ئاوەڵابوون. زۆر لە بیروکراتەکان و ڕابەرانی سیاسی کە لە ئاکامی ئەم سیاسەتانە کەوتبوونە بەر هەڕەشە، درێژەیان بە پشتیوانی کردنی یەکتریدا و ئەوان بەو ڕادەیە بەهێز بوون کە بتوانن، لەگەڵ دەسەڵاتی خرۆشیفدا بە سەرکەوتوویی بکەونە ململانێوە.



**ساڵی ١٩٦٤دا تێکشکانەکانی خرۆشیف چیتر شیاوی فەرامۆش کردن نەبوون و ئەو ناچار بە دەست لە کارکێشانەوە کرد**

## ڕووخانی خرۆشیف

خرۆشیف بە پێچەوانەی لینین و ستالین، هەرگیز دەسەڵاتی موتڵەقی بەدەستنەهێنا. هیچ کاتێکیش ڕاپۆرتێکی پێشکەش بە خەڵکی سۆڤێت، کە هەر چۆنێك بێ نەکرد. خرۆشیف تەنیا تا ئەو زەمەنە بە ڕابەری بنەڕەتی یەکێتیی سۆڤێت مایەوە کە ژمارەی هاوپەیمانەکانی لە دەستەی سەرۆکایەتی و کۆمیتەی ناوەندیدا لە ژمارەی نارازییەکانی زیاتر بوون. بەڵام ئەو زەمانەی کە نارازییانی سیاسی دەستگیر، دوورخستنەوە ویان تەنانەت لە سێدارە دەدران، لەگەڵ مردنی ستالین ئیدی تێپەڕی بوو. نارازییانی

خرۆشیف، و ئەوانەی کە بە دەستی ئەو دەرکرابوون یاخود پلەیان دابەزێنرا بوو، بێ ئەوەی دووربخرێنەوە یان لە سێدارە بدرێن لە ژیاندابوون و هەندێکیان نفووزی خۆشیان هەر ئاوا لە حیزبدا پاراستبوو.

هەڵەکان و تێکشانەکانی خرۆشیف لە ساڵی ١٩٦٤ گەیشتنە قۆناغی قەیران. ئیتر نەدەکرا هەڵە گەورەکانی ئەو لە سیاسەتی دەرەوە و تێشکانەکانی لە کاروباری ناوخۆییدا بە وەفادارییەکی کوێرانەوە فەرامۆش بکرێن. لەوانەیە جیدیترین ناکامی ئەو لە کاروباری ناوخۆییدا شکستی هەوڵێك بوو کە بۆ دووپارچەکردنی سیستەمی لە رادەبەدەر ناوەندگرتووی ئابووریدا خستییە گەڕ.دانیل دیلر ئەو چاکسازییانە بەم شێوەیە وەسف دەکا:

دووپارچەکردنی زیاتری دەزگاکانی دەوڵەتی و لقەکانی حیزب و گۆڕینی ئەوان بۆ دەزگای سەربەخۆ: دەستەیەکی پیشەسازی (یان شاری) و دەستەیەکی تری کشتوکاڵی (لادێ نشین) کۆمیتە حیزبییەکانی پیشەسازیی لە ناوچەکان و ئەنجوومەنەکان... تا رادەیەك سەرپەرشتی دانیشتوانی شارەکانیان دەکرد... کۆمیتە حیزبییەکانی کشتوکاڵییش سەرپەرشتی دانیشتوانی لادێکان و دەزگا پەیوەندیدارەکانیان بە ئەستۆوە بوو... ئەم دووپارچەکردنە لە بەشێکی سەرەکی کاروبارەکاندا بە شکست کۆتایی هات. چونکە سەرە ئاڵۆزیی و بێسەرەوبەرەییەکی نابەجێی هێنایە ئاراو هەروەها هێزی زۆر لە بەرێوەبەران و بیروکراتەکانی کەم کردەوەیان خستنییە بەر باری هەڕەشەوە[٤٢].

لە وەش بەولاوە، هەر بەو جۆرە کە دیلر ئەنجامگیری دەکا کۆششی خرۆشیف بۆ نوێکردنەوەی رێکخستنی حیزب و حکوومەت لە ساڵی ١٩٦٢، رەنگە ئەو داهێنانە ناوخۆییە بووبێ کە پێش هەر شتێکی تر زیانی بە پێگەی ئەو گەیاند[٤٣].

لە ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٤ کۆمیتەی ناوەندی رایگەیاند کە خرۆشیف بە بەڵگەی تەمەنی زۆرو نەخۆشییەکەیەوە،داوای کردووە کە لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی ببەخشرێ. ئەم قسەیە درۆ بوو. بەڵکو دەستەی سەرۆکایەتی کۆمیتەی ناوەندی ئەو داوایەی لەو کردبوو. ئەوەدابڕینێکی سووکایەتی پێکردن بوو، بەڵام خرۆشیف دەیتوانی دڵی خۆی بەوە خۆش بکا کە ئەگەر ئەم رووداوە لە ساڵانی زووتردا روویدابا، ئەویان لەسەر کار لادەداو پاشان لە سێدارەشیان دەدا.

لیۆنید برژنیف، کە لێپرسراوی بەرنامەی کارەساتهێنی خاکە بەیارەکان بوو، بۆ سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیست و ئیلیکسی کۆسیگین بۆ سەرۆك وەزیران هەڵبژێردران.

## (5)

## سەردەمی برژنیف ١٩٦٤- ١٩٨٢



لیۆنید برژنیف پاش دەست لە کارکێشانەوەی خرۆشیف بوو بە سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیست

لیۆنید برژنیف لە ساڵی ١٩٠٦ لە ئۆکراین هاتەدنیاوە. ئەو لە لاویدا بەڵگەنامەی ئەندازیاری وەرگرت و لە ساڵی ١٩٣١دا بە حزبی کۆمۆنیستەوە پەیوەست بوو، لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا لە سوپادا خزمەتی کردو پاش ئەوە چەند پلەیەکی گرنگی لە حیزبدا پێ سپێردرا بوو. ئەو پلە حیزبییانە بەر لە هەڵبژاردنی ئەو بۆ کۆمیتەی ناوەندی حیزب لە ساڵی ١٩٥٧ بوون. یەکێك بوو لەو پیاوانەی جێی سەرنجی خرۆشیف بوو و لە ساڵی ١٩٦٠دا بە ناونیشانی سکرتێری دەستەی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی باڵا هەڵبژێردرا. پاش دابڕانی خرۆشیف لە ساڵی ١٩٦٤، بوو بە سکرتێری گشتی یا سکرتێری یەکەمی حیزب.

### هەوڵدان بۆ رابەری

هەر دروست بەو شێوەیەی کە سەردەمی ستالین و سەردەمی خرۆشیف، لە جیاتی جێنشینێکی دیاریکراو، سەردەمی برژنیفیش بە رابەرایەتی کۆمیتە فەرمانڕەواکان دەستیپێکرد، سەردەمی برژنیف بەڕۆڵ گێڕانی کاتیی چەند رابەرێك دەستیپێکرد. ئیلیکسی کۆسیگین بە ناونیشانی سەرۆك وەزیران، یان سەرۆکی دەوڵەت، و برژنیف بە ناونیشانی سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیست هەڵبژێردرا. لەوەڕا کە حیزبی کۆمۆنیست کۆنتڕۆڵی دەوڵەتی لە دەستدابوو، دەسەڵاتی سەرۆکی حیزب، مانای برژنیف، لە دەسەڵاتی کۆسیگین زیاتر بوو.



***برژنیف سوپا دەڕەنجێنێ***

*ژورس مدودف لە کتێبی ئەندروپف، ژیاننامەی جێنشینی برژنیفدا، رایدەگەیەنێ کە بە گومانی ئەو، سوپا لە برژنیف دڵڕەنجاو بوو، چونکە ئەو بانگەشەی زێدە رەوی لە بارەی قارەمانێتی خۆیەوە لە جەنگی دووەمی جیهانی بڵاوکردەوەو هەر خۆشی میداڵی دەدا بە خۆی.*

*فەرماندە پلەبەرزەکانی جەنگ، لە بارەی خەیاڵئامێزیی لە بارەی رۆڵی برژنیف لە جەنگدا، دڵیان رەنجا بوو. ئەوان زانیارییان هەبوو، کە بۆ بەدەستهێنانی ئەو میداڵانە چ شتێك پێویست بوو، و کاتێك کە برژنیف، "نیشانی سەرکەوتن"ی بەخۆی بەخشی، ئەوان لە ناخەوە تووڕەبوون. ئەو "نیشان"ە تەنیا بەو دەستەیە لە فەرماندەکانی جەنگ دەدرا، لە شەڕگەیەکدا یان لە سەرانسەری شەڕگەکاندا بە سەرکەوتوویی پلانی جەنگیاندادەڕشت و پیادەیان دەکرد... کاتێك ئەو، "نیشان"ی لەم بابەتەی دا بەخۆیدا لە بەهای میداڵە جەنگییەکانی کەم کردەوە.*

هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی حیزب، دەسەڵاتی برژنیف یان سنووردار دەکرد، و ئەو، هەرگیز نەیتوانی دەسەڵاتی تەواوی بەسەر سیاسەتەکانی دەوڵەتدا هەبێ. ئەو بە ناونیشانی، ئەندامێك لە ناو کەمینەیەکی فەرمانڕەوادا حوکمی بەڕێوەدەبرد. بەو مانایە وێڕای چەند کەسێکی تر لە دەسەڵاتدا هاوبەش بوو. لە ریزی ئەوانەش، میخائیل سۆسۆلۆف و نیکۆلای پادگورنی، ئەندامانی پۆلیت بوورو (مەکتەبی سیاسی) کە نفووزێکی فراوانیان هەبوو. هەروەها وێڕای ئەوانیش ئیلیکسی کۆسیگین. بەڵام برژنیف ئەندامی کەمینەیەکی فەرمانڕەوا بوو کە لە لێڕوانینی دنیای دەرەوە رووپەکی زیاتری هەبوو. چونکە بە ناونیشانی سکرتێری گشتی، ئەویان بە باڵاتر لەوانیتر قبووڵ دەکرد.

برژنیفیش، هەروەکو خرۆشیف و ستالین، پێگەی دەسەڵاتی خۆی مەحکەم کردو بەو پێیە کە دۆستانی جێ متمانەی خۆی لە پلە خاوەننفووز و خاوەن دەسەڵاتەکاندا دانا. بە پێی قسەی ڤدور بۆرلاتسکی، راوێژکاری خرۆشیف، شێوازێك کە ئەوی لە سەرکردیەتیدا پاراست، شێوازێك بوو بە تەواوی لە شێوازی پێشینەکانی خۆی جیاواز بوو.

تایبەتمەندی بنەڕەتیی برژنیف بە ناونیشانی رابەری سیاسی هەر لە مانگەکانی سەرەتای حکوومەتدا ئاشکرا بوو. پیاوێکی لە رادەبەدەر خاوەن پارێز، لەسەرە رێگای گەیشتن بە دەسەڵات، تەنانەت یەك هەنگاویشی بێ بیرو بەرژەوەندبینی هەڵ نەگرتبوو. برژنیف هەر لە سەرەتاوە هەڵوێستێکی میانڕۆی وەرگرتبوو. لە راستیدا پەیڕەوی لە نەریتێك دەکرد کە پاش مردنی لینین وەرگیرا بوو. هەمووان دەیانزانی ستالینیش لە رێگەی میانڕەوییەوە گەیشتبووە دەسەڵات.[٤٤]





## رابەری برژنیف شێوە وەردەگرێ

برژنیف وەکو سکرتێری گشتی، بەرپرسی پەیوەندییەکان بوو لەگەڵ هەموو دەوڵەتانی کۆمۆنیستیدا. لە حاڵێکدا کە ئیلیکسی کۆسیگین بەرپرسیارێتی پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوڵەتانی ناکۆمۆنیست لە ئەستۆدا بوو. ئیلیکسی کۆسیگین لە هەمانکاتدا بەرپرسیاری دارشتنی بەرنامەکانی ئابووری بوو، و بەرنامەی حەوت ساڵە کە خرۆشیف لە ساڵی ١٩٥٩دادایرشتبوو، دووبارە پێداچوونەوەو نوێکردنەوەی تێدا کردو ئامانجەکانی ئەم بەرنامەیەی پتر واقیعیانە کرد. ئەو ئامانجە نوێیانە هەنگاونان بەرەو بەهێزکردنی بنەمای بەرگری و پیشەسازییە قورسەکانی دەگرتەوە.



**ئامانجەکانی ئیلیکسی کوسیگین نوێکردنەوەی پەیکەری بەرگری و فراوان کردنی پیشەسازییە قورسەکان بوو**

ڕەهەندی ستالین سرینەوە سست بۆوەو تا ئاستێك پێچەوانەش بۆوە. ئەمەش زەمانێك بوو کە خاڵی ئەرێتی لە بارەی کارەکانی ستالینەوە لە لێدوان و راگەیەنەرە بە کۆمەڵییەکانی ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتدا خرایەروو. مامەڵەی نەرمی خرۆشیف لەگەڵ هونەرمەندان و نووسەران، ئاراستەیەکی پێچەوانەی بەخۆوە گرت و هەموو نووسەران و هونەرمەندان ناچاربوون پەیرەوی لە ئاراستەی هونەری رەسمی بکەن، ئەو ئاراستەیەی کە بەرپرسانی حیزب دیارییان دەکرد. بەربەرینترین گۆڕان لە بوواری رێبازی سیاسیدا، بەلاوەنانی ئەو چاکسازییە حیزبییە بوو کە لە هەوڵدانە بێ بەرهەمەکانی خرۆشیفدا بۆ جیاکردنەوەی بەرنامەرێژی هەر دوو بەشی کشتوکاڵی و پیشەسازی و سەرەتای دوورکەوتنەوە لە ناوەندگەرایی لەدام و دەزگاکانی کارگێڕیدا، شێوەی وەگرتبوو. سیاسەتە ئابورییەکانی برژنیف، پێداویستییەکانی سوپای بەسەر پێداویستییەکانی وڵاتدا پەسن دەدا. سەرباری هەموو ئەمانە، ژورس مدودف ئاماژەیەك بەوە دەکا، نوێکردنەوەی دامەزراوەی سوپا لە دەیەی ١٩٧٠و



سەرەتای دەیەی ١٩٨٠ سیمایەکی کردەنی و دەرەکی بەخۆیەوە نەگرت: "لە ساڵی ١٩٧٩دا بیرورای سوپا بەرامبەر بە رابەرایەتی برژنیف بە توندی رەخنەئامێز بوو. سوپایەکی بەهێز ناتوانێ لەگەڵ ئابوورییەکی لاواز و کشتوکاڵێکی هەژاردا بەیەکەوە بژین"(٤٥). بۆدابینکردنی پێداویستیی سوپا، برژنیف گرنگیدانی خۆی لەسەر ئابووری چڕکردەوە.

## سیاسەتی ئابووری

برژنیف، کە هەرگیز سەرکردەیەکی داهێنەر نەبوو، ئەو بە رێگەی پیادەکردنی بەرنامەی پێنج ساڵەی تر (١٩٦٦- ١٩٧٠) کەوتە سەرۆکاری سیاسەتی ئابووری. لە کۆتایی دەیەی ١٩٦٠دا هەلومەرجی کەش و هەوا یاریدەی گەشەکردنی ئابووری لە واری کشتوکاڵدا کرد، کە ئەوەش بە دەوری خۆی بووە بایسی بەرەو پێش بردنی ئابووری، کە یەکێك لەوانە پیشەسازی بوو. لە ئاکامدا، ئاستی ژیان بەرەو هەوراز هەڵکشا، بەڵام ئەو رۆژانەی خۆشیی هێندەی درێژە نەکێشا. بۆرلاتسکی، سستی ئابووری لە میانەی دووبارە نوێکردنەوەی دامەزراوەی سوپا بە دەستی برژنیف بەم شێوەیە وەسف دەکا:

لە ماوەی سەردەمی برژنیفدا، ژاپۆن بوو بە دووەم هێزی پیشەسازی لە جیهاندا، کۆریای باشووریش پێ بە پێی هەنگاوەکانی ژاپۆن هەنگاوی هەڵگرت، و هەروەها بەرازیلیش بوو بە یەکێك لە ناوەندە نوێیەکانی هێزی پیشەسازی. ئەمە راستە کە ئێمەی سۆڤێت لە رووی سەربازییەوە بووینە هاوشانی پێشکەوتووترین هێزە پیشەسازییەکانی دنیای نوێ، بەڵام بەچی نرخێك! ئەو نرخەی کەدامان، بووە هۆکاری ئەوەی پاشەکشێی تەکنولۆژیی لە هەموو بوارەکانی تری ئابووریدا زیاتر بێت، و حاڵ و باری کشتوکاڵ لە پێشان زیاتر روو بە کارەسات بڕوا (٤٦).

لە دەیەی ١٩٧٠، کەش و هەوای نالەبار، کە هەمیشە وەکو تارماییەك سێبەر بەسەر هەرێمی سەخت و وشکی روسیادا دەکا، گەڕایەوە بۆ ئەوەی بەڵایەك بەسەر کشتوکاڵدا بهێنێ، و لە ئەنجامدا، کەمایەتی خواردەمەنی هاتە پێشەوە. لە هەمانکاتدا، نارەزایەتی گشتی بە دەست سەختی گوزەرانی ژیان، نەبوونی پێگەی گونجاو و ناکامی لە پلان و بەرنامە رێژیی ناوەندی، خۆی لە گیروگرفتی کۆمەڵایەتی لە بابەت خووگرتن بە ئەلکول خواردنەوەی سەرتاپاییدا، وەدەرخست.

لە دەیەی ١٩٧٠، گیروگرفتەکانی پەیوەست بە کەمیی خواردەمەنی، بە هۆی بەرنامەرێژیی لاوازەوە، کە لە تایبەتمەندییەکانی مێژووی سۆڤێتییە، سەخت تربوو. برسێتی و تووڕەیی

سەرچاوەگرتوو لە بێدادییەوە، دەستیان نایە نێو دەستی یەك و لە سەردەمی برژنیفدا بووە هۆكاری هاتنەخوارەوەی ئاستی خۆشگوزەرانیی ژیانی تاكە كەس. لە ئەنجامدا هاتنەخوارەوەی نەردەوان ئاسای ئاستی ژیان لە سۆڤێت، كە پاش پەنجا ساڵ لە تێپەڕینی شۆڕش هێشتا نەیتوانیبوو بگاتە ئاستی ژیانی ڕۆژئاوا، گەشەی ئابووری لە ماوەی دەیەی ١٩٧٠ سست بوو. ئابووری روو بەدارمان، كاری سیاسەتی مەزنخوازیی برژنیفی دژوارتر دەكرد.

## سیاسەتی دەرەوەی برژنیف

هەرچەندە برژنیف و هەموو رابەرانی سۆڤێت پشتیوانییان لە سیاسەتی خرۆشیف لە بواری پێكەوە ژیانی ئاشتیانە، كرد، پاش ساڵی ١٩٦٥ پەیوەندییەكانی نێوان ئەمریكا و سۆڤێت روو بە ساردی بوو، و ئەمەش زیاتر لە سۆنگایی ئەو گرژییانەوە بوو كە بە جەنگی ڤێتنامەوە پەیوەست بوون.



یەكە موشەكییەكانی ڤێتنامی باكوور، فاكتەری خستنە خوارەوەی زۆر لە فڕۆكەكانی ئەمریكا بوون

جەنگی ڤێتنام یەكێتیی سۆڤێتی خستبووە سەر دووڕییانێكەوە. ڤێتنامی باكوور بە هاوپەیمانی سۆڤێتو چین دەژمێردرا، و ئێستا لەگەڵ ڤێتنامی باشووردا لە حاڵی جەنگدا بوو، ڤێتنامی باشوور لە باری ئابووری و سەربازییەوە بەتوندی لە لایەن ئەمریكاوە پشتیوانی لێ دەكرا. برژنیف و كۆسیگین ئارەزوویان دەكرد هاوكاری سەربازیی و كەرەسەی جەنگی بۆ ڤێتنامی باكوور بنێرن. بەڵام لەوە نیگەران بوون نەوەكو ئەم كارە دوژمنایەتی ئەمریكا زیاتر پەرەپێبدا. لە لایەكی ترەوە، نەناردنی هاوكاری دەبووە هۆی ئەوەی كە چینییەكان برەنجێنی، ئەوان وایان هەست دەكرد لەبەر ئەوەی سۆڤێت خاوەنی بەرینترین ئابووری سۆسیالیستییە، ئەوا ناچارە دەبێ بۆ پشتیوانی كردنی ڤێتنامی باكوور پێشڕەوی ئەوانیتر بێت.



لە هەمانكاتیشدا، چینییەكان رێگەیان نەدا بۆ گواستنەوەی كەرەسەو تفاقی سەربازیی بۆ ڤێتنامی باكوور كەڵك لە بنكەكانی چین وەربگرن.دانیل دیلر لەمبارەیەوە وتارێك دەگوازێتەوە لە یەكێك لە رۆژنامەكانی چیندا بلاوبۆتەوە، تێیدا هاتووە: "ئەگەر ئێمە موداخەلەمان لە پرسی ڤێتنامدا بكردبایەو بەشداریمان تێدا بكربایە {مانای وایە یاریدەی سۆڤێتیمان دەدا تا هاوكاری ڤێتنامی باكوور بكا}، هاوكاری ئێمە بۆ ئەوان {برژنیف و كۆسیگین} دەبووە هۆكاری ئەوەی ڤێتنام بچێتە ناو بازنەی هاوكاری سۆڤێت- ئەمریكاوە" بە مانایەكی دیكە، چینییەكان لەوە دەترسان سۆڤێت لە رووبەڕووبوونەوەی ئەمریكا ئەوەندە جیدی نەبێ، و تەنانەت لەوانەشە لە دژی چینییەكان لاگیری ئەمریكا بكا.

چینییەكان تەنانەت ئەم بابەتەشیان لەبەرچاو دەگرت كە هاوكاری كردن لەگەڵ سۆڤێتییەكان بۆ یاریدەدانی ڤێتنامی باكوور، سۆڤێت لای وڵاتانی جیهانی سێیەم خۆشەویست دەكا، و ئەمەش لە حاڵێكدا بوو كە سۆڤێت و چین بۆ بەدەستهێنانی نفووز كێبەركێی یەكتریان دەكرد. گرژیی نێوان سۆڤێت و چین تا سەروبەندی كشانەوەی ئەمریكا لە ڤێتنام لە نیوەی دەیەی ١٩٧٠ درێژەی كێشا. بە هەرحاڵ، ڤێتنام تاكە پرسی كێشەو بەرەی نێوان ئەو دوو وڵاتە نەبوو.

## سیاسەتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و "روحی گلاسبوورو"

لە سەرەتادا، نفووزی سۆڤێت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە ساڵی ١٩٦٧ پاش جەنگی شەش رۆژەی نێوان عەرەبەكان و ئیسرائیل كەوتەبەر لەق بوونەوە. سەركەوتنی سەرسامهێنەری ئیسرائیل، یەكێك لە نیشانەكانی ناحەزیی و لاوازی كەرەسەو تفاقی سەربازی بوو كە (سۆڤێت) كڕیارە عەرەبەكانی خۆی پێ تەیار كردبوو. چەندین وڵاتی عەرەبی، لەوانەش میسر، بە بەڵگەی پشتیوانی ئەمریكا لە ئیسرائیل و تۆڵەكردنەوەی ئەم كارە، پەیوەندییەكانی خۆی لەگەڵ ئەمریكا بڕی، بەڵام سۆڤێت سەری لە شەڕەكەوە هێنایەدەرێ، و لە دووبارە چەكداركردن و تەیاركردنەوەی سوپاكانی میسر، سووریاو ئەردەن هاوكاری پێشكەش كردن.

كەمێك پاش جەنگی شەش رۆژە، كۆسیگین، سەرۆك وەزیرانی سۆڤێت، دیداری لەگەڵ لیندون. بی. جانسون، سەرۆك كۆماری ئەمریكا، لە گلاسبوورو، كە كەوتۆتە نیوجرسییەوە، كرد تا لە بارەی گرژییەكانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و كێشەكانی پەیوەست بە بڵاوبوونەوەی چەكی ئەتۆمی گوتوبێژ ودانووستاندن بكەن. "روحی گلاسبوورو" كە سەرهەڵدانی جۆرێك لە هاودەنگی نێوان هەردوو رابەر بوو، ئەو ئەنجامەی لێكەوتەوە لە بواری بڵاونەبوونەوەی ئەم جۆرە چەكانەدا

پەیماننامەیەك گرێ بدەن. جونسون و كۆسیگین لە ساڵی ١٩٦٨دا ئەم پەیماننامەیان مۆركرد. بەڵام هیچ هێزێكی ئەتۆمی دیكە نەخرایە نێو ئەم پەیماننامەیەوە. لەوەش بەولاوە، كاتێك، ئەنجوومەنی سەنا سەرگەرمی تەسدیق كردنی پەیماننامەكە بوو، یەكێتیی سۆڤیێت دەستدرێژی كردە سەر چیكوسلۆڤاكیاو وەفاداربوون بەو پەیماننامەیە كاڵ بۆوە.

## سۆڤیێت پەلاماری چیكوسلۆڤاكیا دەدا

پەلاماردانی سۆڤیێت بۆ چیكوسلۆڤاكیا لە مانگی ئابی ١٩٦٨ وەڵامی ئەو جوولانەوە ئازادیخوازییەی حكوومەتی چیك لە پێناوی بەرینكردنی ئازادی دەربڕین و كۆبوونەوەو ئازادی



**ڕابەرانی چیك، لەوانە ئەلیكساندەر دوبچك (كەسی سێیەم لە لای چەپەوە) لە كۆنفرانسێكدا لە مۆسكۆ گوت وبێژ دەربارەی ناكۆكییەكانی نێو فەلسەفەی سۆڤیێت، دەكا**

مەزهەب، و قبوولكردنی زیاتری حیزبە سیاسییە ناڕازییەكان، بوو. ئەم چاكسازییانە هەڕەشەیان لە حكوومەتی سۆسیالیستی دەكرد. رووبەڕووبوونەوەی سۆڤیێت لەگەڵ ئەم جوولانەوەیەدا بەو ئاوایە بوو سۆڤیێت بە درۆ وای پیشاندا كە حكوومەتی چیكوسلۆڤاكیا بۆدامركاندنەوەی فیتنە، داوای هاوكاری كردووە. بەڵام هەم حكوومەتی چیك و هەم رابەرانی



حیزبی كۆمۆنیست لەو وڵاتە لە هەمبەر هاتنی هێزەكانی سۆڤیێتی بۆ نێو ئەو وڵاتە نارەزاییان كردو نكوڵییان لەمەسەلەی داواكردنی هاوكاری لە سۆڤیێت كرد. لەم كاتەدا، مۆسكۆ بۆ ئەوەی خۆی وا پیشان بدات داوای راوێژ دەكا، رابەرانی چیكی بانگهێشت كرد تا لە مۆسكۆ كونفرانسێك دەرباری ناكۆكی فەلسەفەی سۆڤیێت لەگەڵ ئەندێشە نوێیەكانی كە لەسەر بنەمای "سۆسیالیزمی دیموكراتیك" لە چیكوسلۆڤاكیا سەریان هەڵداوە، و لەهەمان حاڵدا لە بارەی كۆمەڵە حیزبێكەوە كە بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات لەو وڵاتەدا كێبەركێیان بوو، گوتوبێژودانووستاندن بكەن. برژنیف، كۆسیگین و هەموو نوێنەرانی سۆڤیێتیش چوونە شاری سییەرنا لەسەر سنووری چیكوسلۆڤاكیا. ئەلیكساندر دوبچك، سكرتێری یەكەمی حیزب، و هەموو ئەندامانی حكوومەتەكەی نوێنەرایەتی چیكوسلۆڤاكیایان دەكرد. پاش تەواوبوونی دانووستاندنەكان، وا دەهاتە بەرچاو كە سۆڤیێت رەزامەندییان لە سەركردایەتی چیكی هەبووە و رازی بوون بەوەی سوپای خۆیان بكشێننەوە. بەڵام لە كۆتایی مانگی ئابی ١٩٦٨، ئەم وڵاتە چوار سەد هەزار سەربازی خۆی رەوانەی چیكوسلۆڤاكیا كرد تاكو ئەو شتەی كە بە روانینی ئەو جولانەوەیەكی دژە شۆڕش بوو، دابمركێنێتەوە. نیكۆڵاس ریاسا نوڤسكی لەو باوەڕەدایە خولیای پەلاماردانی سۆڤیێت بۆ چیكوسلۆڤاكیا "لە ترسی ئەوەبوو، چیكەكان سەرەڕای ئەوەی كە پەیمانی وارشۆیان رەت نەكردبۆوە، بەڵام بیانەوێ هەمواركردنێك لە پەیمانەكەدا بێننەكایەوە... {و} هەروەها ترسی ئەوەش هەبوو كە نەوەكو لە نێو {یەكێتیی سۆڤیێتدا} لە رادەبەدەر لیبڕالیزم ببێتە مایەی سەرنج راكێشان"[٤٨].

((دوبچك))یان دەستگیرو ناچاركرد كە كۆتایی بە جوولانەوەی ئازادیخوازیی چیك بهێنێ. ساڵی پاشتر ئەویان لەسەركارلادا و لە جێگەی ئەودا كەسێكی سەختگیریان لە لایەنگرانی سۆڤیێتی دامەزراند كە هەموو شوێنەوارەكانی بەجێماوی جووڵانەوەی ئازادیخوازی تێكشكاند. بەرەنجامی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ چیكەكان سەرهەڵدانی پرەنسیپەكانی برژنیف بوو، بۆ جڵەوگرتن لە جوولانەوە سەربەخۆییخوازەكان لە هاوشێوەی چیك بوون، گەڵاڵەكراو نووسرایەوە.

## پرەنسیپەكانی برژنیف

پرەنسیپەكانی برژنیف، كە لە ساڵی ١٩٦٨ راگەیەنران، بەو هۆكارە بوو دەستێوەردانی بەربڵاوی سۆڤیێت لە كاروباری ناوخۆیی هەموو وڵاتانی سۆسیالیستی، بەتایبەتی وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵاتی كە لەگەڵ (سۆڤیێت)دا هاوسنوور بوون، ئاراستە بكا. ئامانج لە





دەستێوەردانی لەم بابەتە ئەوەبوو بەربەستی لە هەمواركردنی شێوەی حكوومەتی ماركسیستی- لینیستی، كە بە سەختگیرییەكی تەواوە لە لایەن سۆڤێتەوە، هەڵوێستی لە بارەوە وەرگیرابوو، بكا. پرەنسیپەكانی برژنیف بەم ئاوایەوە ئاراستە دەكرا تا ستراتیژی ناوچە بێلایەنەكان لە مەودای دوورودرێژدا بەكاربرێ تاكو مەترسی دوژمنانی كلاسیكی یەكێتیی سۆڤێت لە ئەوروپا كەم بكاتەوە.

بەڵام ئەم پرەنسیپانە لە بواری كردەوەدا لە زامنكردنی {پاراستنی} ناوچە بێلایەنەكان لە نێوان سۆڤێت و دەستدرێژیكارانی ئەوروپای رۆژئاوا بەولاوەترەوە چوو، و هەموو وڵاتانی سوسیالیستی گرتەوە، و هەروا بە سێناییەوە بانگەشەی كرد كە یەكێتیی سۆڤێت و هاوپەیمانەكانی تری لە هەر كێشەو ململانێیەكی وڵاتێكی سۆسیالیستی كە بیەوێ هەڕەشە لە رژێمی سۆسیالیستی ئەو وڵاتە بكا یان لە نێوی بەرێ یان تەنانەت هەمواری بكا، ئەوا لە حاڵی پێویستدا، موداخەلەی سەربازی تێدا دەكەن. ئەو پرەنسیپانە باسیان لێ كرا بەتوندی جەختی دەكردەوە كە هەر گۆڕانكارییەك لە حكوومەتی سۆسیالیستیدا ئەگەر بە لێڕوانینی مۆسكۆ نادۆستانە بێت، بێ گوێدانە ئەوەش ئەم گۆڕانكارییە جۆری سۆسیالیزمی وڵاتەكە بگۆڕێ یان نا، ئەوا لەگەڵ موداخەلەی سۆڤێت بەرەوڕوو دەبێتەوە.

پەلاماردانی چیكوسلۆڤاكیا وێڕای دەربڕینەكانی برژنیف لەسەر ئەو بنەمایەی سۆڤێت ئامادەیە لە بەرامبەر راگەیاندنی سەربەخۆیی هەر دەوڵەتێكدا، كە زەمانێك حكوومەتی كۆمۆنیستی قبووڵ كردووە، بەرهەڵستی بنوێنێ، پەیوەندییەكانی سۆڤێتی لەگەڵ جیهانی رۆژئاوا بەرەو گرژیی برد. هەر لەو كاتەدا، ریچارد نیكسۆن سەرگەرمی ململانێی هەڵبژاردنی سەرۆكایەتی كۆمار بوو. یەكێك لەو بەرنامانەی كەئەو رایگەیاند، جێگیركردنی پەیوەندیگەلی باشتر بوو لەگەڵ جیهانی كۆمۆنیستیدا، هەمان ئەو سیاسەتەی كە بە دووركەوتنەوە لە بارگرژیی ناسرابوو.

## دووركەوتنەوە لە بارگرژیی

وێناكردنی نیكسۆن لە بارەی سیاسەتی دووركەوتنەوە لە بارگرژیی لە راستیدا كەمكردنەوەی گرژییەكانی نێوان میللەتان بوو، شتێك بوو یەكجار نزیك لە ئەندێشەی "پێكەوە ژیانی ئاشتیانە"ی خرۆشیف. كۆششی ئەو، لە زەوینەی دووركەوتنەوە لە بارگرژیی بووە هۆكاری مۆركردنی پەیماننامەیەك لەگەڵ سۆڤێت بۆ سنووردانان بۆ بڵاوكردنەوەی چەكەكان. سیاسەتی دووركەوتنەوە لە بارگرژیی، لە لایەن سەرۆك كۆمارەكانی پاشتریش، جیراڵد فورد و جیمی كارتەریشەوە، پەیڕەوی لێكرا.





**جیمی كارتەر سەرۆك كۆماری ئەمریكا و لیونید برژنیف سەرۆك كۆماری سۆڤێت، دووەمین پەیمانی سنووردانان بۆ چەكە ستراتیژییەكان مۆردەكەن**

پەیوەندی بازرگانی لە نێوان ئەو دوو زلهێزەدا بەرەو باشی چوو، و ئەمەش بە هۆكاری ئەوەوە بوو، سۆڤێت بە ئاستێكی رۆژ بەرۆژ زیاتر گەنمی لە ئەمریكا دەكڕی. بەڵام ئەو پەیوەندییانە كاتێك بەرەو ئاڵۆزی چوون كە سیاسەتوانانی ئەمریكا، لەوانەش ئەندامانی كۆنگریس، نارەزاییان لەبەرامبەر سۆڤێت دەربڕی. سەرباری هەموو ئەو حاڵانە، كارتەرو برژنیف دووەمین پەیماننامەی سنووردانان بۆ چەكە ستراتیژییەكانیان (ساڵت) لە ساڵی ١٩٧٩دا مۆركرد. بەڵام پاش یەك حەفتە لە سنووربەزاندنی سۆڤێت بۆ نێو ئەفغانستان، پشتیوانی ئەمریكا لە سیاسەتی دووركەوتنەوە لە بارگرژیی كۆتایی هات. سۆڤێت بەو هۆیەوە دەستدرێژی كردە سەر ئەفغانستان بەو ئومێدەی كە سوود لە گۆڕانكارییە سیاسییەكانی ئەو وڵاتە وەربگرێ و سەركردەیەكی كارتۆنی كە بۆ مۆسكۆ وەفادار بێ لەوێ دابمەزرێنێ. بەو پێیە، وێڕای بوونی شایەتگەلێكی نالێك بەم كارە، دەسەڵاتدارانی سۆڤێتی دەستخۆشییان لەم دەست درێژییە كردو ئەمەیان بە جۆرە شۆڕشێكی راستەقینەی دیموكراتیك و جەماوەری دانا"[٤٩]. پەرچەكرداری ئەمریكا بەرامبەر بەم كارە قەدەغەكردنی بازرگانی بوو لەگەڵ سۆڤێت و هەروەها رەتكردنەوەی بەشداریكردن لە ئۆلۆمپییەكانی هاوینی ١٩٨٠ لە مۆسكۆ بوو.

سەرکەوتنی رۆنالد ریگانی کۆماریخواز و پارێزگاریخواز لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی کۆماری ئەمریکا لە ساڵی ١٩٨٠، ئومێدی دووركەوتنەوە لە بارگرژیی لەداهاتوویەکی نزیکدادایە بەربا. بەڵام کاتێك ئەو کەسایەتییە سەرسەختە دژە کۆمۆنیستە لەسەر کورسی سەرۆکایەتی دانیشت، قەیرانێك لە پۆڵۆنیا هاتەکایەوە، کە دەیتوانی بڕیاری سۆڤێت لە بارەی پیادەکردنی پرەنسیپەکانی برژنیفەوە بەنێو بۆتەی تاقیکردنەوەدا ببات.

## لخ والساو رایەڵەی پۆڵونیا

لە مانگی ئابی ١٩٨٠، لە شاری گۆدانسك لە پۆڵۆنیا، لە کارگەی کەشتی دروستکردنی لینین، بە هۆکاری بەرزبوونەوەی نرخی گۆشت، مانگرتنێك سەری هەڵدا. لخ والسا رابەری ئەم مانگرتنە، کە یەکێك بوو لە کرێکارانی ئەم کارگەیە، ناوی لە گروپی مانگرتووان نا یەکێتیی رایەڵەکان و ئەوانی بەرەو بە رەسمی ناسینی سەربەخۆیی یەکێتییەکانی کرێکاران و هەروەها مافی مانگرتن رابەریی کرد. ئیدوارد گیرك سکرتێری یەکەم و رابەری حیزبی کۆمۆنیستی پۆڵۆنیا، نە تەنیا هەر ئەو مافانەی بەوان بەخشی، بەڵکو بەڵێنی کرێی زێدەبار، خزمەتگوزارییە پزیشکییەکان و خواردەمەنی باشتری لە بەرامبەر مەرجی گەڕانەوەیان بۆ سەرکارەکانی خۆیان، پێدان.

هەرچەندە گیرك کەمێك پاش ئەو رووداوە، بە هۆی جێبەجێکردنی داخوازییەکانی مانگرتووەکانەوە، لەسەر کار نەما، جێنشینی ئەو بەڵێنی دا ئەو رێکەوتنانەی لەگەڵ مانگرتواندا کراون، بە رێزلێگیراوادابنێ. هەروەها ئەو بەڵێنی لێبڕاوانەیدا کە پەیوەست بوونی شێلگیرانەی خۆی لەگەڵ سۆڤێتدا بپارێزێ، چونکە لە دەستێوەردانی ئەو وڵاتە دەترسا. پاش ئەوە دەوڵەت لە بنەڕەتدا نکوڵی لە مانگرتنی یەك لایەنە کردو ئەم کارەی بە رەسمی نەناسی. مانگرتن سەری هەڵدایەوەو تا دیسامبری ١٩٨١ کەم و زۆر لە جۆشان و خرۆشاندا بوو، تا ئەوەبوو لەو بەروارەوە حکومەتی سەربازیی راگەیانرا و رابەرانی یەکێتی رایەڵەکان، لەوانەش والسا، دەستگیرکران و ماوەیەك خرانە بەندیخانەوە.





لخ والسا لە نارەزایەتی بەرامبەر بەرزبوونەوەی نرخی گۆشت، مانگرتنی بەرپاکرد

برژنیف، پرنسیپەکانی خۆی دایە حکوومەتی پۆڵۆنیا و داوای لەو حکوومەتە کرد لە رێگەی تەسدیق کردنی قانوونێك بۆ قەدەغەکردنی مانگرتن، رێکەوتننامە نوێیەکەی لەگەڵ یەکێتی رایەڵەکاندا بشکێنێ. ئەو، بۆ جەختکردنەوە لەسەرداخوازییەکەی خۆی سوپای نارده نزیکی سنووری سۆڤێت- پۆڵۆنیا تا لەوێ دەست بە مانۆڕ بکا. سۆڤێت بە رواڵەت هایدانەکانی کارتەری لە دژی دەستێوەردانی راستەوخۆ بەهەند هەڵنەگرتبوو. (کارتەر لەو رۆژگارەدا دوایین رۆژانی سەرۆکایەتی کۆماری خۆی دەگوزەراند)

رۆبێرت دانیلز پەرچەکرداری ئەمریکا لە بەرامبەر قەیرانەکانی ئەفغانستان و پۆڵۆنیا، بە "جەنگی نوێی سارد" ناودەبا کە تێیدا "جۆرە پارێزگاریخوازییەکی دووبارە سەرهەڵداو، ئەمریکاییەکانی خستە بارێکەوە، یەکێتیی سۆڤێت بە شەیتانی شۆڕشگێڕ و فراوانخواز تەماشا بکەن کە دەرەتان نییە پێکەوە ژیانێکی ئاشتییانەی جێ متمانە یان رێکەوتنێکی درێژخایەن لە گەڵیدا سەربگرێ"[٥٠] لە راستیدا رۆنالد ریگان ئەویش یەکێتیی سۆڤێتی بە "ئیمپراتۆری شەڕەنگێز"[٥١] ناونا.

ریگان سەرۆك کۆماری ئەمریکا، ئابلۆقەی بازرگانی هەم لەسەر سۆڤێت و هەم لەسەر پۆڵۆنیاشی- لە رێگای سەرکوتکردنی مانگرتنەکان هاوکاری سۆڤێتییەکانی کردبوو- دانا، بەڵام زۆرترین کەمتەرخەمی لە سەرهەڵدانی قەیراندا ئاراستەی یەکێتیی سۆڤێت کرا. ئەم ئابلۆقەیە هەناردنی خواردەمەنی بۆ پۆڵۆنیاو پێداویستییەکانی نەوت و گازی بۆ سۆڤێت راگرت لە هەمانکاتدا، لە زەوینەی خزمەتگوزارییەکانی فڕۆکەوانیی و ئیمتیازگەلی بەندەریی (دەریایی)دا بەرتەسکبوونەوەیەکی هێنایە ئاراوە. لە میانی ئەو قۆناغەدا، برژنیف، کە تەندروستی کەوتبووە مەترسییەوە، رۆژ بەرۆژ زیاتر لە بارەی کاروباری ناوخۆیی وڵاتەکەی بێبایەخی پیشان دەدا. ئەم بێبایەخییە، وێرا بە سستی ئابووری، بە جۆرێکی مەترسیدار بۆ





لای پەرەگرتنی گەندەڵی و چالاکییەکانی بازاڕی رەش پەل و پۆی هاویشت، و ئەم دوو مەسەلەیەش ماوەیەکی زۆر دوورودرێژ لە یەکێتیی سۆڤێت چارەنووسساز بوون.

## گەندەڵیی سۆڤێت پەرەدەستێنێ



**هاوڵاتیانی روس، لە بارەی ئاستی ژیانەوە، جیاوازییەکی گەورەیان هەست پێدەکرد، تەنیا توێژی هەڵبژاردەکان دەیانتوانی ئامێر گەلی لەبابەت تەلەفزیۆن یان خانوو وماڵێکی پلە یەکیان هەبێ**

سستی و تەوەزەلی رژێمی سۆڤێتی بووە هۆکاری ئەوە لە بەرامبەر گەندەڵکارییدا ئابووری سەرتاپاگیر تووشی بەڵاو کارەسات ببێت. لەوێوە کە بۆسکۆ ناوەندی بەرنامەڕێژی ئابووری هەموو جۆرە لایەنێکی ژیانی سۆڤێت بوو، و لەو رووەوە کە کاڵاکان و خزمەتگوزارییەکان، زیاتر لە ژێر دەستی بیرۆکراتەکانی دەوڵەتدابوو، وەك لە حوکم و کاری بازاڕ، بە ناچار ئەو رژێمە پەشۆکاو و سستە ئابوورییە، دەرفەتگەلێکی یەکجار فراوانیان بۆ بەرتیلخۆری فەراهەم کرد. لە راستیدا ئەو بێ سەروبەرییە لە رژێمێکی ئاوا ناوەندگرتوودا پێکهاتبوو، بە گەندەڵکاریی دەشکایەوە. بیروکراتەکان لە سەرتاسەری یەکێتیی سۆڤێتدا دانسقەترین کاڵاو خزمەتگوزارییان، هەم بۆ سوود لێوەرگرتنی کەسێتی خۆیان و هەمیش بۆدانووستاندێکی پڕ لە قازانج، لەبەردەستدا بوو. لە سەردەمی برژنیفدا، گەندەڵیی ئەوەندە بەربلاوبوو، زۆرێك لە دەرکەوتەکانی ئەو گەندەڵییە وەکو رەواڵێکی ئاسایی کارگێڕی تەماشا دەکرا. بۆ نموونە بەڕێوەبەرانی فرۆشگاکان و بیرۆکراتەکان دەیانتوانی ئاراستەی کاڵاکان لەسەر هێڵی فرۆشگا



دەوڵەتییەکانەوە لاڕێ بکەن و بیان بەن لە بازاڕی رەشدا بیانفرۆشن. ئەوان هەرگیز خۆیان کاڵا دزراوەکانیان هەڵنەدەگرت، بەڵکو بۆ فرۆشتنیان تەسلیم بە دەڵاڵ و کەسانی تریان دەکردو پاشان بەشی خۆیان لێ هەڵدەگرت.

برژنیف بۆ خۆی زانیاری یەکسەر و راستەوخۆی لە بارەی رەواڵی بازاڕی رەش لەبەردەستدا بوو، پاش ئەوەی گەیشتە پلەی سکرتێری گشتی حیزب، رۆژێك نوسەرێك ئاخاوتنێکی گلەیی ئامێزی بەم ئاوایە هێنایە پێشەیەوە: "تۆ ئاگات لێ نییە ژیان چەندە سەختە، ژیانی هیچ کەسێك بە مووچەکەی خۆی دابین نابێ، سەردەمانی لاوی خۆم دێتەوە بیر کاتێك لە زانکۆی هونەری دەمخوێند. ئێمەی قوتابیانی زانکۆیی لە رێگای بەتاڵکردنی باری واگۆنەکانی شەمەندەفەر پارەیەکی زێدەبارمان بەدەستدەهێنا. ئەم کارە چۆن بەڕێوە دەچوو؟ سێ گونییە لەباری کونتێینەر دادەگیرا {بۆ هەر کەسێك کە پارەکەی دەدایە}و یەك گونییە بۆ ئێمە حسێب دەکرا. ژیانی خەڵك لەم وڵاتەدا ئاوایە." بە روانینی برلاتیسکی، برژنیف بازاڕی رەشیشی هەر بەو پێودانگە، بە شێوەیەکی گشتی دەزانی "هەروەکو دزییەکانی لە بەشی خزمەتگوزارییەکان ودانی بەرتیل بە بیرۆکراتەکان"(٥٢) کارێکی سروشتی بوو.

ئەندامانی چینی هەڵبژاردەکان دەیانتوانی لە فرۆشگا تایبەتییەکان شت بکڕن، ئەو فرۆشگایانە کە کاڵای تایبەتییان هەبوو دەستی هاوڵاتییانی ئاسایی پێڕانەدەگەیشت.لە مۆسکۆ، بە هۆی قاتیی توندی بێ جێیەوە دوو یان چەند خێزانێك لە یەك تەلاردا دەژیان، بەرپرسانی دەستڕۆیشتووی کارگێڕی دەیانتوانی خانووی پلە یەکیان هەبێ. ژمارەی تایبەتی خەرجییەکانی کارگێڕی مۆڵەتی دەدا، ئەم کارگوزارە بەخت باشانەی دەوڵەت، ڤێلا بۆ خۆیان دروست بکەن.

لە وڵاتێکدا بەڕەسمی بانگەشەی ئەوە دەکرا، کە هەموو هاوڵاتیان یەکسانن، جیاوازیگەلی زۆر گەورە لە نێوان ئاستی ژیانی بەرپرسانی دەوڵەتی و حیزبی، و خەڵکانی ئاسایی، لە هەموو ئاستە کۆمەڵایەتییەکاندا کاریگەرییەکی تێکدەرانەی لەسەر مەعنەویاتی خەڵك دانا. بەو پێیە بوو دەوڵەت بایەخێکی شانۆگەری ئاسای لە بارەی ئەو جموجولە تاوان ئامێزانە نیشاندا. لە راستیدا بەشێك لە سزاکانی دزییەکان و پارەلێدانەکان لە سێدارەدان بوو. بەڵام سەرباری هەموو ئەمانە، رواڵەتی گەندەلکاری بە شێوەی رۆژ بەڕۆژ زیاتر کارەساتبارتر دەبوو.

## بەرتیل خۆریی و بازاڕی ڕەش: دوو نموونە

نوێنەرێك لە وەزارەتی ماسی گرتن حوکمی مردنی بەسەردا درابوو، چونکە لە فێڵ و کەڵەکێکدا بەشداری کردبوو، بەڕێوەبەرانی کارگەیەکی قووتووبەندیی، کاغەزی سەر قووتووەکانی خاویار کە گرانبەها بوو، گۆڕیبوو و کاغەزی ماسی هەرزان بەهای (سەردین)یان لەسەر چەسپاند بوو بۆ ئەوەی خاویارەکان بۆ بازاڕی ڕەش بەڕێ بکەن. ژورس مدودف لە کتێبی ئەندرۆپۆف، ژیاننامەی جێنشینی.

***ئاخاوتنی درۆزنانەی دیموکراسی***

*ڕۆڵی حیزبی کومۆنیست لە حکوومەتی یەکێتیی سۆڤێتدا، بە ئەنقەست تەمومژاویی بوو. دەزگای پڕوپاگەندەی سۆڤێتی لەدارشتنی هەواڵەکانی رادیو و تەلەفزیۆندا، هاوکاری دەکرد تا ئەفسانەی سەربەخۆیی حیزب لە دەوڵەت، پەیتا پەیتا دووبارە بکاتەوە. ئیگور لوك لە وتارێکدا بە ناونیشانی "بەشی ئەمریکای باکوور لە رادیوی مۆسکۆ" دا کە لە کتێبی وێنەسازانی نوێدانراوی لادیسلاوبیتمان، شرۆڤەی دەکا کە چۆن رادیۆی مۆسکۆ هەوڵی دەدا وێنایەکی نادروست لەسەر لێکچوونی دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤێت لەگەڵ دیموکراسی رۆژئاوادا پێشکەش بکا.*

*لە راستیدا هەموو بەشە هەواڵەکانی بەشەکانی ئەمریکای باکووری رادیۆی مۆسکۆ بە ئاماژەکردن بە دەوڵەتی سۆڤێتی دەست پێدەکا... بیسەرانی هەواڵەکان گوێبیستی هەواڵی ١٥٠٠ نوێنەر لە ئەنجوومەنی یەکێتیی کۆمارەکانی سۆڤێتی دەبن... هەندێك جاران دەوڵەت ئاماژە بە بوونی ((گوت و بێژی)) جیدیانە دەکا کە بە رێکەوت پێش کۆتایی هاتنی کاری ئەنجوومەن روویداوە.*

*ئەمانە لەوانەیە بەشتگەلێکی ناچیزو بێ بایەخ بێنە بەرچاو، بەڵام دەبێ رەچاوی ئەوە بکرێ هەموو هێزەکانی بڕیاردان لەیەکێتیی سۆڤێت بەدەستی ئورگانە جیاجیاکانی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کومۆنیستی سۆڤێتی سپێردراوە. یەکەمین پەیامی دەزگاکانی دەوڵەتی، وەکو ئەنجوومەنی باڵاو ئەنجوومەنی وەزیرانی یەکێتیی کۆمارەکانی سۆڤێتی، تەنیا ئەوەیە کە چاودێری پیادەکردنی فەرمانەکانی حیزب بکا. دووەمین ئامانجی دەوڵەتی سۆڤێتی راگەیاندنی ئەو خەیاڵە خاوەیە لە جیهانی دەرەوە کە یەکێتیی سۆڤێت وڵاتێکە کەم و زۆر هەروەکو وڵاتانی دیموکراسی رۆژئاوا وایە.*

برژنیف بەم شرۆڤەیەی خوارەوە پەردە لەسەر ئەمە لادەدا: "ئەم قووتووی ماسی سەردین بە تایبەتی لە نێو ریستورانتە هەڵبژاردەکانی شاری سوچی {شارێکە لە لێواری دەریای رەش کە هەوارێکی تایبەتی بوو بۆ پشوو و حەسانەوەی هەڵبژاردن}و جێگاکانی دیکە دابەش دەکراو لەوێوە سواری کەشتی دەکراو رەوانەی دەرەوەی وڵات دەکرا تا دووبارە ناوەکەی بخرێتە نێو قووتووی خاویارو لە نێو تۆڕی بازرگانی دەرەوەی سۆڤێتدا بێتە فرۆشتن. ئەم قووتوانە لە نێو ئەو



ریستورانتانە بە ناونیشانی ماسی سەردین وەردەگیراو تۆماردەکرا، بەڵام دواجار وەکو خاویار دەفرۆشراو زیادە پارەکەی تۆمار نەدەکرا"[٥٣]. بەڕێوەبەرانی کارگەی قووتووبەندی داهاتی قاچاغی ئەم کەڵەکبازییەیان لە نێوان خۆیان و بەڕێوەبەرانی ریستورانتەکان دابەش دەکرد.

هیدریك سمیت بەرپرسی نووسینگەی نوێنەرایەتی رۆژنامەی نیویۆرك تایمز لە مۆسکۆ لە دەیەی ١٩٧٠، یەك بەشی تەواوی لە کتێبی خۆی بە ناوی (ڕوسەکان) لە بارەی گەندەڵی و بازاڕی رەش تەرخان کردووە. ئەو، دەیان راپۆرتی کورتی ئاشکراکردوە و ئەوانەش وەکو نموونە گەلێکی ئاسایی لە گەندەڵیی هەمەلایەنەی ژیانی خەڵکی سۆڤێتی دەخاتەڕوو. بۆ نموونە سمیت لە رۆژگارێکدا دوو بلیتی پێشبڕکێی پاڵەوانێتی وەرزشی هاکی، کە بەدەست هێنانیان نێزیك بە مەحاڵ بوو،دابوو بە یەکێك لە دۆستانی سۆڤێتی خۆی، بەو خەیاڵەوە کە وەرگری ئەم دیارییە، لە رادەبەدەر بەم کارە خۆشحاڵ دەبێ. لە جیاتی ئەم خۆشحاڵییە، ئەو دۆستەی بلیتەکانی دایە ژنێك کە سەرۆکایەتی یەکێك لە فرۆشگاکانی کەلوپەلی خواردەمەنی بە ئەستۆوە بوو، و بۆ سمیتی روونکردەوە، شادی ئەو لەم کارە زۆر لەو شادییەی تەماشاکردنی پێشبڕکێ زیاتر بووە. ئەگەر سەرۆکی فرۆشگای ناوبراو جارجار پاداشتێکی وەرنەگرتبایە، حاڵی خێزانی ئەو دۆستە دەکەوتە تەنگژەوە، چونکە لەوانەبوو ئەوان لە دەستکەوتنی کەلوپەلی دەگمەن بێبەش بکا "باشترین خواردن ئەو ژنە دەماندانێ." ئەو سەرۆکی فرۆشگای دەوڵەتییە، باشترین کاڵاکانی نێو قەفەزەکانی هەڵدەگرت بە جۆرێکی تایبەتی بیانفرۆشێ، و کڕیارەکانی دیکەش بە حاڵی خۆیانەوە بەجێ بێڵێ- کڕیارەکانی دیکە ئەوانە کە یان نەیاندەویست لە بازاڕی رەش شت بکڕن یاخود توانای ئەوەیان نەبوو، بێ پەنا ناچار بوون کاڵاو شمەکی بێ کەڵك و ناچیزی کە بەرماوە بوو هەڵبگرن. دۆستەکەی سمیت لە درێژەی قسەکانیدا گوتبووی: "ئەو لە رادەبەدەر دەوڵەمەندە چونکە خەڵك بۆ بەدەستهێنانی ئەو کاڵایانە پارەی زێدەباری دەدەنێ"[٥٤].

ماوەیەکی دوور پێش سەردەمی برژنیف، گەندەڵی بڵاوبوو. بەڵام واپێدەچێ لە سەردەمی رابەرایەتی ئەودا شێوەی سەرتاپێی بەخۆیەوە گرتبێ.

برژنیف بە ئەنقەست چاوپۆشی لە گەندەڵی دەکرد. ئەو روسانەی کە بیروڕای چاکسازییان هەبوو، بۆ چارەسەری کێشەکە چاویان لە جێنشینی ئەو، یوری ئەندروپۆڤ، بڕیبوو، مردنی برژنیف دەرەتانی هەبوو کە دەرفەتێك بۆ چاکسازی فەراهەم بکا.





## مردنی برژنیف

لیونید برژنیف لە نۆڤەمبەری ١٩٨٢ لە تەمەنی ٧٥ ساڵیدا بە هۆی وەستانی دڵەوە، گیانی لە دەستدا. ئەو ماوەی هەژدە ساڵ رابەری یەکەمی سۆڤیێت بوو. تەنیا ستالین، کە بیست و نۆ ساڵ لەسەر دەسەڵات بوو، لە مبارەیەوە لە پێش ئەوەوە بوو،دانیل دیلر لە گردوکۆی سەردەمی گەندەڵی ئامێزی برژنیفدا دەڵێ، جگە لە بەرزبوونەوەی کەسایەتی خۆی بایەخی بە هیچ شتێکی تر نەدەدا: "نووسینەکانی بە جۆرێکی بەربڵاو پەخش دەکران... وێنەکانی ئەو لەسەر تابلۆی ئاگادارییەکان و لە تەشریفاتە رەسمییەکاندا دەکەوتنە بەرچاو... و خزمەتی سەربازی ئەو لە جەنگی دووەمی جیهانیدا زل دەکرایەوە"[٥٥].

ئەندامێکی دیکەی بەساڵداچووی پۆلیت بوورو، یوری ئەندروپۆف، بە پلەی سکرتێری گشتی، بوو بە جێنشینی برژنیف. ژورس مدودف، رووداوی سەیری سەرۆکی پێشووی کەی. جی. بی بەم شێوەیە وەسف دەکا: هەڵبژاردنی ئەندرۆپۆف رووداوێکی لە ناکاو بوو: هەر بەوجۆرە کە هەواڵی مردنی برژنیف لە نێو ئاپۆرای خەڵکی سۆڤێتدا هەستێکی نەخرۆشاند، هەڵبژاردنی ئەندروپۆفیش تاسەیەکی نەهێنایە ئاراوە. یەکەمین نوکتەیەکی تاڵ کە لەمبارەیەوە بڵاوبۆوە لەوانەیە تیشکدانەوەی راستی هەستی گشتی بووبێ: ئەندرۆپۆف بۆ رۆژنامەوانێکی بیانی روونیدەکاتەوە کە ئەو دڵنیایە خەڵك بەدوای دەکەون، "و ئەوانەش بە دوای مندا نایەن ئەوا مسۆگەر بە دوای برژنیفدا دەڕۆن"[٥٦].

## مردنی ئەندرۆپۆف

ئەندرۆپۆف لە ژانویەی ١٩٨٤، پازدە مانگ پاش وەرگرتنی پۆستەکەی، کۆچی دوایی کرد. ئەو، لە ماوەی کورتی دەسەڵاتدارێتی خۆیدا، لەو تۆمەتانەی کۆڵێیەوە کە لە زەمەنی برژنیفدا لە بارەی گەندەڵییەوە بە توندی بڵاوبوونەوە. هەروەها، زنجیرەیەك بەرنامەی چاکسازیی ئابووری، وەکو دوورکەوتنەوە لە ناوەندگەرێتی لە بەرنامەی ئابووری و بەخشینی بەرپرسیاریی زیاتر بە بیرۆکراتە ناوچەییەکانی پێشنیار کرد. هەموو ئەوانە کۆششەکانی خرۆشیفیان لە زەوینەی چاکسازیدا، دێنایەوە بیر.

مدودف، لە کتێبەکەیدا کە لە ساڵی ١٩٨٣دا بڵاوبۆوە، جێنشینی ئەندروپۆف لە جێی برژنیفدا شرۆڤە دەکا، و تەئکید لە دژوارییەکانی پیادەکردنی چاکسازییەکان دەکاتەوە:

بەڵام لە یەکێتیی سۆڤێت ئاڵوگۆڕی دەستەی پلە بەرزی فەرمانڕەوا بەخێرایی ناکرێ بەرێوەبچێت، چونکە ئەو رژێمە لەسەر بنەمای رەزامەندی ئەندامانی بەرجەستەی کۆمیتەی



ناوەندی و دەوڵەت کاردەکا، نەك لە رێگای هەڵبژاردنی ئازاد لە میانی قۆناغی دیاریکراودا، چونکە ئەمەی دوایی لەوانەیە پێکهاتەی دەسەڵات لە حیزبدا بگۆڕێ یان بە جۆرێکی تەواوەتی ژێرەو ژووری بکا.[٥٧]

سەرباری هەموو ئەو حاڵانە، بەرنامەی ئەندرۆپۆف تا رادەیەك پیادەکرا و جۆرێك سەرکەوتنی بەدەستهێنا.

## پاش ئەندروپۆف

کنستانتین چرننکو، سەرۆکێکی تری پێشووی پۆلیسی نهێنی، بوو بە جێنشینی ئەندروپۆف، کە ئەویش لە مارتی ١٩٨٥دا سەری نایەوە بێ ئەوەی گۆڕانکارییەکی سەرەکی لەو داهێنانەدا بکا کە ئەندروپۆف دەستی پێکردبوو. مردنی سێ رابەری بەساڵدا چووی پۆلیت بوورو کە جاری وا هەیە بە((پیر سەروەریی)) یان ((فەرمانڕەوایی بەساڵداچووان)) ناودەبرا، وای پێویست دەکرد کە خوێنی تازە بە نێو دەمارەکانی کرملیندا بێت و بچێت. سەرۆکەکانی حیزب بەو دەرەنجامە گەیشتبوون، دەبێ رابەرانی لاو پەیدا بکەن، رۆژێك پاش مردنی چرننکو، سەرنجیان لەسەر (میخائیل گۆرباچۆف)ی تەمەن پەنجاو چوار ساڵە لاوترین ئەندامی پۆلیت بوورو بوو، راگیر بوو، و ئەویان بە پلەی سکرتێری گشتی نوێ هەڵبژارد.

نەوەی بەساڵداچووی سەرکردایەتی سۆڤێت میرات خۆرانی بەلشەفیکەکانی ساڵی ١٩١٧، حکوومەتێکیان هێنابووە کایەوە کە لە زۆر لایەنەوە کارکردنی نەگونجاو بوو. ئەگەر هیوایەك بە درێژەکێشانی ئەم رژێمە هەبووبێ، ئەوا ئاتاجی بە چاکسازییەکی یەکجار بەربڵاوبوو. برلاتسکی پاژێك لە کێشەکانی ئەو زەوینەیە بەم ئاوایە دەناسێنێ:

دەرسێکی گرنگ دەکرێ لەو قۆناغە وەربگیرێ پەیبردنی ئەم خاڵە بوو کە رژێمی جێبەجێکردن و حکوومەتێکی لە ژێر دەسەڵاتی ستالیندا شێوەی گرتبوو، لە تێکشکان بەولاوە شتێکی دیکە نییە. دەوڵەت نەهەر تەنیا هانی پێشکەوتنی نەدەدا، بەڵکو بە شێوەیەکی زۆر زەق دەبووە بەربەستی رێگای پێشکەوتنی ئابووری، کولتووری و ئەخلاقی کۆمەڵگا... چاکسازییەکانی بنەڕەتیی و پیریسترۆیکا ((دووبارە بنیاتنانەوە)) بێ هیچ چەندوچوونێك رێگای مەنتیقی دەربازبوون لەو داچەقینە رەهایە بوو.[٥٨]

بڕیار بوو رابەرای نوێ، میخائیل گۆرباچۆف، ئەم چاکسازییانە پیادە بکا.





# (٦)

## قۆناغی گۆرباچۆف ١٩٨٥- ١٩٩١

میخائیل گۆرباچۆف، کە پاش کنستانتین چرننکو بەزوویی بە سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیست هەڵبژێردرا، لە دووی مارتی ١٩٣١ لە ستاڤرۆپۆل کە ناوچەیەك بوو لە باشووری رۆژئاوای روسیا، هاتۆتە دنیاوە. ئەو کە لە لادێ لەدایك ببوو، لە لاویدا چالاکیی خۆی لە حیزبی کۆمۆنیستدا دەستپێکرد. کاری لە سەرەتادا شوفێری ئامێرێکی درەوکردن بوو لە نێو کێڵگەیەکی دەوڵەتیدا و هەروەها لە کۆمسمۆل (یەکێتی لاوانی کۆمۆنیست)دا چالاکی هەبوو. گۆرباچۆف لە ساڵی ١٩٥٥ خوێندنی خۆی لە رشتەی مافدا تەواوکرد و ئینجا وردە وردە پلەی لە نێو حیزبدا بەرزبۆوە و توانی چەندین پۆستی ناوچەیی بەدەست بهێنێ. لە ساڵی ١٩٧١دا بوو بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٧٩ بوو بە ئەندامی گرنگترین دامەزراوەی یەکێتیی سۆڤیێت، مانای پۆلیت بوورو، ئەمەش لە زەمانێکدا بوو وڵات پێویستی بەوە بوو کە هێزی لاو جێگەی پیرسەرووەری بگرێتەوە. گۆرباچۆف وەکو لاوترین ئەندامی پۆلیت بوورو، ئەو کەسە بوو هیوای ئەوەی لێدەکرا پۆستی رابەریی بە دەست بهێنێ.



**میخائیل گورباچۆف کەسانی لاوو خاوەن بیری چاکسازیخوازانەی هێنایە سەرکار**

ژورس مدودف زەوینەی مێژوویی رۆژانەی سەرەتایی قۆناغی میخائیل گۆرباچۆف بەم شێوەیە شرۆڤە دەکا:



لە زەمەنی ستالیندا، لە هەر شوێنێکدا گۆڕانێك رووی دابا، دەسبەجێ شێوازەکانی ترساندن و تۆقاندن دەستی پێدەکرد. دەزگای مەزنی سەرکوتکردن، بە گرنگترین ئامرازی دەسەڵاتی تاکەکەسی سکرتێری گشتی دەژمێردرا. لە لایەکی ترەوە، خرۆشیف بە پلەی یەکەم لە رێگەی دامودەزگا حیزبییەوە، فەرمانڕەوایی دەکرد... چینێکی دیکە لە هەڵبژاردەی حیزبی- حکوومی لە گۆڕان نەهاتووی نوێ کە بەسەر کاروبار رادەگەیشت بەرەبەرە شێوەی وەرگرت و گروپێکی تازیاری لە فەرمانڕەوایان پێکهێنا... ئەم گروپە نۆژەنکردنەوەی پەیکەری کۆمەڵایەتی، ئابووری و کولتووری قەدەغەکردو سەرەنجام لە {دوایەمین رۆژانی ساڵانی سەردەمی برژنیفدا} بەرەنجامی کار سەری بۆ گەندەڵی کێشایەوە و بوو بە فەرمانڕەوای بەساڵداچووان.[٥٩]

بەو پێودانگە یەکێك لە یەکەمین کارەکانی گۆرباچۆف ئەوەبوو کەسانی لاو و خاوەن بیری چاکسازیخوازانە لە نێو پۆلیت بوورو و لە ئەنجوومەنی وەزیرانی دەوڵەتدا دابمەزرێنێ، و هەروەها جوولانەوەی چاکسازیخوازی کە ئەندرۆپۆف، سەرۆکی پێش قۆناغی چرننکو، دەستی پێکردبوو، بگرێتە دەست. سەرۆکی کەی. جی. بی، کە ماوەیەکی کورت لەسەر دەسەڵات بوو، هاوکاری {گۆرباچۆف}ی بۆ گەیشتن بە پولیف بوورو کردبوو، ئێستا ئەم پیاوە کە لەو لاوتر بوو کۆششی دەکرد روانین و ئەندێشەکانی ئامۆژگارەکەی خۆی بخاتە کارەوە.

### نفووزی بنکەکانی هەواڵ وەشاندن لە حەشارگەکانی سۆڤێتی

پێویستی پیادەکردنی چاکسازییەکان، تا رادەیەك ئاکامی وریابوونەوەی زۆرایەتی خەڵك لە بارەی گەندەڵی رابەران و بیرۆکراتەکان، بوو. ئەم وریاییە زیاتر بەهۆکاری پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیای گەیاندنەوە بوو. پێش پێشکەوتنی میدیا گشتییەکانی رادیو و تەلەفزیۆن، کە هەروەکو زۆری تر لە تەکنۆلۆژیاکان درەنگ گەیشتە یەکێتیی سۆڤێت، دەوڵەت توانیبووی بە شێوەیەکی بنبڕ بڵاوبوونەوەی هەواڵ لە وڵاتدا جڵەو بکا و بەو پێیە دەیتوانی لێکدانەوەکانی خەڵك لە بارەی شێوازی ژیان، هەم لە ناوەوەو هەم لە دەرەوە، بەپێی ئارەزووی خۆیدابڕێژێ.

بڵاوبوونەوەی شەپۆلەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆن هەموو ئەو بەرنامانەی تێکدا. سەرەڕای ئەوپەڕی کۆششی دەوڵەت بۆ هێنانەدی بەربەست لەبەردەم بڵاوبوونەوەی هەواڵەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆن، وێنایەك لە ژیانی دەرەوەی یەکێتیی سۆڤێت لە بەرامبەر چاوی خەڵکی ئەم وڵاتە ئاشکرا بوو. لە هەموو ئەمانەش بەولاوە، خەڵك خۆشیان دەیانتوانی سەیری دەوروبەر بکەن و

بۆ خۆیان بەرەنجامی گەندەڵکاریی ڕۆژ بەڕۆژ رووبەزیادی دەوروبەری خۆیان ببینن. گەندەڵی، لەسەر ئاستی ژیانی هەڵبژاردەکانی حکوومەت و حیزب لەلایەکەوەو ژیانی خەڵکی ئاسایی لە لایەکی دیکەوە، جیاوازیگەلێکی هێنایە ئاراوە. ناچاریی هاوڵاتیانی ئاسایی بۆ کەڵك وەرگرتن لە بازاڕی رەش بۆ بەدەستهێنانی کەلوپەلی پێویست، و بەدەستهێنانی زانیاری زیاتر و بەربلاو لەمەڕ ئەم بێدادییانەوە، کە بە هۆکاری پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیای میدیاکانەوە باشتر بەڕێوە دەچوو، شتێك بوو، ئیدی دەرەتانی ئەوە نەبوو چاوپۆشی لێ بکرێ. چاکسازیی کەوتە سەری سەرەوەی لیستی کارەکانی رابەری نوێ.



**گورباچۆف و سەرۆك کۆماری ئەمریکا رۆناڵد ریگان لە بارەی قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی چەکەکان دانوستاندن دەکەن**

کارێکی تری بەراییەکانی گۆرباچۆف، دروونەوەی ئەو درزە بوو کە کەوتبووە نێو پەیوەندییەکانی ئەمریکاوە، بۆ ئەوەی بتوانێ رەوتی پێشبڕکێی خۆپڕچەك کردن ئارام بکاتەوە. پلانی یەکێتیی سۆڤێت بۆ پاراستنی هاوسەنگی لە چەکدا لەگەڵ ئەمریکای زۆر دەوڵەمەندتردا، ببووە بایسی ئەوەی کە ماوە گەلێکی زۆر پێشتر دواین پرزەی لە سەرچاوە ئابوورییەکانی ئەو وڵاتە بڕی بوو. گۆرباچۆف دەیویست پێداویستییەکانی وڵاتەکەی لە بواری چەکە گرانبەهاکان کەم بکاتەوە. لە لایەکی دیکەوە، هێزێکی سەربازی ئەوپەڕی مەشق دیتوو لە بەرکاهێنانی ئەو چەکانە بپارێزێ، بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی ئاوا، لە ئوکتۆبەری ساڵی



١٩٨٦ لە کۆنفراسێکی باڵا لەگەڵ رۆناڵد ریگان، سەرۆك کۆماری ئەمریکا، لە ئایسلاند دیداری کرد. لەو دیدارەدا پێشکەوتن گەلێك لە زەوینەی بەرتەسك کردنەوەی چەکەکاندا بەدەست هات، بەڵام دانووستاندن لە بارەی تاقیکردنەوەی چەکەکان بە شکست کۆتایی هات. سەرەڕای ئەمەش، کوێرە رێیەك لە زەوینەی پەیوەندیگەلێکی باشتر پێکهات و بەڕێوەبراو گۆرباچۆف رووی کردە پرسگەلێکی پێویستی تر: سستی ئابووری، خرۆشانی رۆژ بە رۆژ زیاتری خەڵك بۆ بەدەستهێنانی ئازادی زیاتر. هیچی وای نەبرد کە دوو زاراوەی تایبەتی لەسەر رووپەڕی چاپەمەنی جیهان وەدەرکەوتن. ئەم دوو زاراوەیە هەمان ئەو دوو بەرنامە چاکسازییەکەی خرۆشیف بوون: ((پیرسترۆیکا)) بە مانای دووبارە بنیاتنانەوە و ((گلاسنووست)) مانای کەش و هەوای کراوەی سیاسی.

## پیرسترۆیکا

گۆرباچۆف، بنیاتنەری پیروسترویکا، بەزۆری وەك نەخشەکێشی پاشەکشێی سۆڤێت و لە بەینچوونی کۆمۆنیزم لە ئەوروپای رۆژهەڵات، سیمای دەخرێتە بەرچاو، بەڵام هەرگیز ئەو مەرامەی نەبوو. سەرەڕای ئەمە، ئەو چاکسازییانەی بەڕێوەی بردن بە جۆرێکی بێ بووار هەمان ئەو بەرەنجامانەی هێنایە ئاراوە.دانیل دیلر، پیروسترۆیکا لە خانەی واقیعی خۆیدا دادەنێ: "توێژینەوەی پیروسترویکا هەموو بنەما بنەڕەتییەکان و سەرەتاییەکانی سۆسیالیزم، وەکو رێ نەدان بە مولکدارێتی تایبەتی و یەکسانی لەداهاتەکانی، راکێشایە نێو دەمەتەقێوە... چاکسازییەکانی {گۆرباچۆف} لە زەوینەی چاوپێدا خشاندنەوە بە ئابووریدا یەکەمجار کەم بوو، زۆر لەو ئاستەش کەمتر بە باوەڕی پسپۆڕانی رۆژئاوا بۆ ئاڵوگۆڕی ئابووری سۆڤێت بە پێویست دەزانرا"[٦٠].

تا دەست پێکردنی پیرسترۆیکا لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٨٠، کۆشش کردن بۆ باشترکردنی هەلومەرجی ژیان لەسۆڤێت لە رێگەی بەرهەمهێنانی پیشەسازی و کشتوکاڵییەوە، تەنیا شوێنەوارێکی رووکەشی لە سیستەمی بەرنامەرێژی ناوەندگرتوودا هێنایەکایەوە، ئەو سیستەمەی کە ئابووری سۆسیالیستی بوونی ئەم جۆرەی سیستەمەی دەکرد بەکارێکی پێویست. کەس بە دوواداچوونی لە بارەی بنەماکانی بەرنامەرێژی ناوەندگرتوو نەکرد. چاکسازییە بەراییەکان تەنیا حاڵەتێکی ئارامکەرەوەیان هەبوو. ئەو چاکسازییانە، ریشە بنەڕەتییەکانی شکستی ئابووری سۆسیالیستییان بە کەم بایەخ وەرگرتبوو، هۆکارێك بوون لە





بابەتی بەرنامەڕێژییە پڕ دەردەسەرییەکان و کەم بەرهەم و هەروەها کونترۆڵ کردنە بیرۆکراتییەکان کە بەربەستیان لە بەرهەم هەڵگرتنەوەی سوودبەخشی چالاکییەکانی هەر دامەزراوەیەکی بایەخدار دەکرد. بۆ خستنەڕووی ڕەهەندی چاوەڕوان کراوی ئابووری سۆڤێتی و چۆنییەتی شکستخواردنی، کارناسانی پێداچوونەوەی بە توێژینەوە لە وڵاتی یەکێتیی سۆڤێت، کارکردنی پیشەسازییەکی سۆڤێتی بەم ئاوایە وەسف دەکا:

نەخشەسازانی {کارگەیەکی بەرهەمهێنانی کارەبا} بە پشت ئەستوری وەرگرتنی تۆربایینی پێویست لە کارگەیەکی بەرهەم هێنانی ئامێر لە سەر وادەی خۆیدا، کە نەخشەسازانی ئەویش بە پشت ئەستوری وەرگرتنی پارچەگەلی مەعدەنی نیوە رووکەشکراو لە کارگەیەکی بنەجێکردنی پارچەی مەعدەنی {کارگای تایبەتی} لەسەر وادەی خۆیدا، دەست بەکاربوون. هەر گۆڕانێك لە تەرزو جۆر یان بڕەکاندا، پێویستی بەوە هەبوو کە ڕەزامەندی و پەسەندکردنی هەموو وەزارەتەکان و دەزگاکانی هاوکار بۆ نەخشەسازی لە زەوینەی کارەباو ئامێر و پیشەسازی مەعدەن، وەربگیرێ- ئەم کارە لە باشترین حاڵەتدا، کارێکی مەزن و کەمەرشکێن بوو [٦١].

لەم وەسفکردنەوە بە ئاسانی دەکرێ ئەنجامگیریی ئەوە بکرێ چۆن تێکشکان یان دواکەوتن لە پرۆسەی بەرهەمی سەرەکی پیشەسازی بۆی هەبوو هەموو بەرنامەکانی دیکە تێکوپێك بدات. لە بازرگانی ئازاددا، تێکشکان و وێرانییەکان لە سیستەمێکی ئاڵۆزدا بەخێرایی قەرەبوو دەکرێتەوەو سارێژ دەبێتەوە- لەوانەیە قاتی بوونی قەڵەمێك بتوانرێ لە ڕێگەی فرۆشیارانی گەورەی کێبەرکێ کەرەوە چارەسەر بکرێ. بەڵام لە ڕژێمێکدا کە بەرنامە ڕێژییەکی ناوەندگرتووی هەیە بەو شێوەیە نییە، چونکە لەو ڕژێمەدا، ڕەوتی بەرهەمهێنان بە پێی بەرنامەیەکی دیاریکراو بەڕێوە دەچێ کێبەرکێی بە کۆمەڵ، مانای کێبەرکێی چەندان و چەند بەرهەم هێنەرێك، بوونێکیان نییە.



پێداویستی هاووڵاتیانی ئاسایی بووە هۆکاری پەرەگرتن و گەشانەوەی پیشەسازیگەلی لە بابەت ئەم کارگەیەی پارچە دروست کردنی ئۆتۆمبێل لە مۆسکۆ

کەموکوڕییەکانی سیستەمی بەرنامەڕێژیی ناوەندگرتووی ستالینی هەر لە سەردەمی لینینەوە دەکەوتە بەرچاو: سیاسەتی نوێی ئابووری، ئاستێکی سنوور تەسکی لە بازرگانی ئازاد لە نێو چینە ئابوورییە لاوازترەکاندا دووبارە بەرقەرار کردبوو. سیاسەتی نوێی ئابووری، سەرکەوتنی گەورەی تۆمارکرد. بەڵام لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئایدۆلۆژی مارکسستیدا نالێك بوو، لە کۆتایی دەیەی ١٩٢٠دا کۆتایی پێ هێنرا. هەر کام لە رابەرانی سۆڤێتی، لە لینینەوە بیگرە تا برژنیف بە دەنگێکی بەرزەوە جەختیان لەوە دەکردەوە کە خۆیان بۆ لە نێوبردنی هەموو شوێنەوارەکانی دامەزراوە تایبەتییەکان بە قازانجی بەرنامەڕێژیی ناوەندگرتووی ئابووری و مولکداریێتی دەوڵەتیی لە هەموو ئاستەکانی بەرهەمهێنانی ئابووری، تەرخانکردوە. سەرەڕای سەرکەوتنی سەرمایەداری بازاڕی ئازاد، کە لە هەموو جیهاندا، لە ئەمریکاوە بیگرە تا دەگاتە دورگەی بچووکی گرنادا لە دەریای کاریبی، شتێکی بەرچاو بوو. سۆڤێت بە هەردوو دەستەوە بەو تیۆرەوە نووسابوو کە بازاڕی ئازاد دەبێتە بایسی سەرهەڵدانی کارەسات. ژورس مدودف لە بارەی ئەم تیۆرە نائاساییە وەسفێك دەخاتە روو:

*لە حاڵێکدا کە ((پلاندارێژەران))ی لایەنگر بە ڕێکخستنی باشتر و دەسەڵاتی زیاتر بەڕێوەبەرەکانن، "پسپۆڕانی ئابووری کۆمەڵایەتی" لە هەندێك بواردا جۆرێك ئازادکردن و قانوونی کردنی چالاکی ئازادی ئابووری پێشنیار دەکەن. ئەوان پەی بەوە دەبەن کە کێبەرکێ و بوونی بازاڕ کاری خۆبەخۆ دەهێنێتە ئاراوە، لە بەرامبەردا، ((بەرنامەدارێژەران)) لەو باوەڕەدان تەکنۆلۆژیای مۆدێرنی کۆمپیوتەری دەتوانێ ملیۆنان گۆڕاو حسێب بکاو بەرنامە ئابوورییەکان کامڵ بکا. ئەوان وا وێنا دەکەن کە کێبەرکێی بازاڕی ئازاد، سەروچاوەکانی داهات لە بەین دەباو زێدە بەرهەمی دێنێتە کایەوە* (٦٢).

**لەو جێیەوە کەیەکێتی سۆڤێت لە بەشی هەرەزۆری مێژووی خۆیدا، گەمی لە دەرەوە دەهێنا، چالاکی زیادکردنی بەروبوومی کشتوکاڵی کۆششێك بوو بۆ دابین کردنی پێویستییەکانی رۆژانەی بەکاربەران**

ئەم باوەڕە مارکسیستییە کە کێبەرکێی بازاڕی ئازاد بایسی لە بەینبردنی سەروچاوەکانی داهات و هێنانەکایەی زێدە بەرهەمە، لەواقیعدا هۆکاری بنەڕەتیی کەمایەتی و نەبوونییەکان بوو لە سەرتاسەری مێژووی یەکێتیی سۆڤێتدا. ((بەرنامەدارێژەران)) کە مدودف لە بارەیانەوە قسە دەکا بەردەوام لە هێنانە بەرهەمی کاڵای تەواو- یان تەنانەت پێداویستییە بنەڕەتییەکان- بۆ خەڵکی سۆڤێت شکستیان هێنا. هیچ کام لە بەرنامەکانی پێنج ساڵە، و هیچ کام لە سۆسیالیزەکردنی زۆرەملێ لە قۆناغی سەردەمی ستالین، سەردەمی خرۆشیف و سەردەمی برژنیفدا نەیانتوانی خواردەمەنی رۆژانەی خەڵکی سۆڤێت دابین بکەن، تا بەوە رادەگا پێداویستییەکانی بەکاربەران لە بواری خانوو و کاڵای رۆژانەدابین بکەن. یەکێتیی سۆڤێت



سەرەڕای ئەوە پاژێکی هەرەزۆری زەوییە بە پیت و بەرەکەتەکانی گۆی زەوی هەبوو، تا رادەیەك لە هەموو مێژووی خۆیدا گەمی لە دەرەوە دەهێنایە ناوەوە. کاتێك کە گۆرباچۆف وەکو سکرتێری گشتی ناسرا، ورده ورده هاونیشیمانیانی ئاسایی سۆڤێت لە کۆڕە تایبەتییەکانیاندا حکوومەتی سۆڤێتییان دەخستە ژێر پرسیارەوە. بەرپرسانی دەوڵەت کە خۆشیان لەمبارەیەوە ڕاڕایی و دوو دڵیان هەبوو، لە ئاشکراکردنیان خۆیان دەبووارد.

لە سەردەمی ماوەکورتی سکرتارییەتی ئەندرۆپۆفدا، خەڵکی ورده ورده و بەشێنەیی لە بارەی پێویستی چاکسازییە بنەڕەتییەکان، چاکسازیگەلێکی کە بتوانێ ولات لە بەلای گەندەڵیی و هەرەسهێنانی ئابووری رزگار بکا، ئاخاوتنیان دەکرد. گۆرباچۆف وەکو پەروەدەکراوی دەستی ئەندرۆپۆف، بڕیاریدابوو کە لە رێگای پیروسترۆیکاوە ئەندێشەی چاکسازیی لە کارپێکردن نزیك بخاتەوە. گۆرباچۆف بۆ بە دەستهێنانی پشتیوانی خەڵك لەم جیابوونەوە ریشەییەی مارکسیزم- لینیزم، وای بە پەسندزانی سیاسەتی کەش و هەوای بەر ئاوەڵای سیاسی یان گلاسنووست پیادە بکا.

## گلاسنووست

گلاسنووست، ئەو سیاسەتەی کە رێگەی دەدا لێکۆڵینەوەو رەخنە- ی بێپەردە لەمەڕ سیاسەتەکانی دەوڵەت بەڕێوە بچێ، دەروازەکانی لە رووی لێشاوگەلی لە پێشگرتن نەهاتووی رەخنەو لێکۆڵینەوە لە بارەی دەوڵەت، پارتی کومۆنیست و رابەرانی دەوڵەت کردەوە. هەربەو جۆرە کە ریمونـد زیکل لە ((مێژووی یەکێتیی سۆڤێتی))دا دەنووسێ، "سەرنووسەران و رۆژنامەوانان و هەموو نووسەران، رۆژنامەکان، بڵاوکراوەکان و بەرنامەکانی تەلەفزیۆن لە شێوەی میدیا گەلێکی گەیەنەریان لێ دەرچوو تا راپۆرتی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زیندوو لەگەڵ بابەتگەلی زۆر بەربلاو و هەمەجۆر تێیاندا تیشك بداتەوە کە پێش گلاسنووست بەجۆرێکی یەکجار شێلگیرانە دەخرانە ژێر سانتسۆرەوە."(٦٣)

ئەم گلاسنووستە لە رکێف دەرچووە ئەو شتە نەبوو کە گۆرباچۆف لە بیری خۆیدا وێنای بۆ دەکرد. دەوڵەت هەوڵیدا گوڕی ئەم گلاسنووستە لە رێگای سانسۆرکردن و بەرتەسککردنەوەی سنوورەکانییەوە رەخنەگرتنەکان کەم بکاتەوە. بەڵام تازە زۆر درەنگ داهاتبوو.دانیل دیلر لەم بارەیەوە دەنووسێ: گۆرباچۆف لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٨٥دا ئەم چەمکەی هێنایە نێو لێکۆڵینەوە سیاسییەکانەوە. رایگەیاند کە گلاسنۆست بە شێوەیەکی لە جیانەهاتوو بە

بروسترویکاوە پەیوەستە. لەبەر ئەوە چاکسازییە ئابوورییەکان لە حاڵێکدا چارەنووسساز دەبن کە بە هاوکاری و پشت گەرمی بەرینی خەڵکەوە پشتیوانی بکرێ... {سەرباری ئەوەش} دەسەڵاتی گەندەڵ و بیرۆکراتی سەرسەخت بۆ هێنانەدی بەربەست و راگرتنی ئاڵوگۆڕی سیاسی، دەبووایە تێك بشکێنرێ."[٦٤]

لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون لە پشتیوانی کردنی ئابووری بازاڕی ئازاد لەوە بەولاوەترەوە چوو، لە چوارچێوەی توێژینەوەیەکی رووتی ئایدیۆلۆژی لە بواری رەوتی سیاسەتی ئابووریدا بێت. توێژینەوەی لەم جۆرە لە هەمان حاڵدا، کێشمەکێشمێك بوو بۆ بەدەست هێنانی سامانێکی بەرچاو کە زەوی و زاری ئەو پەڕی فراوان و بەرینی کشتوکاڵی، نەوت و مەعدەنەکان و خەڵوزی بەرد و تەنانەت دروست کراوە بە نرخەکانی شارەکانیشی دەگرتەوە. رۆژنامەوانان دوسکو دودر و لۆیز برانسۆن، مەسەلەکە بەم جۆرە راڤە دەکەن: بیرۆکراتە سەرسەختەکانی حیزب، کە بەکردەوە ((خاوەنی)) ئابووری چالاکی دەوڵەتیی بوون، نیازو مەرامی ئەوەیان نەبوو بێ شەڕ، تەسلیم ببن. لە لێڕوانینی سەرۆکێکی حیزبی لە ناوچەیەکدا، بەڕێوەبەرێکی حیزبی لە ناحیەیەکدا، یان سەرۆکێکی حیزبی لە شارێکدا، گلاسنووست شتێك بوو، سامان شتێکی تر بوو. ئەوان خوویان بەوەوە گرتبوو، ئەم سامانەیان لە ژێر چنگدابێ. داهات و بەرهەمی مەعدەنەکان، کارگاکان و زەوییە لێڕەوارەکان و بەقووڵی لە نێو ئەو کاروبارانەدا نقوم ببوون، زۆر لەوە قووڵتر کە گۆرباچۆف چاوەڕێی دەکرد.[٦٥]



**دواکەوتنی دەوڵەت لە بڵاوکردنەوەی هەواڵی کارەساتی ئەتۆمی چرنوبیل، رەخنەگرتنی فراوانی لێکەوتەوە**

سەرباری هەموو ئەمانە، گلاسنووست و بیروسترۆیکا، کەش و هەوایەکی گەشبینانەی هێنایە ئاراوە، و خەڵك کەم کەمە کەوتنە سەر بیری پێکهاتنی کۆمەڵگایەکی ئازاد.

کاتێك هەمووان وردە وردە توانییان بە



ئازادی قسە بکەن، کۆنترۆڵکردنی رەوتی ئازادانەی ئاگادارییەکان بووە کارێکی مەحاڵ. لە رابردوودا تەنیا چەند کەسێکی ناڕازی و نالێك ئازایەتی قسەکردنیان هەبوو. بەدووداگەڕان و گرتن و یان ترساندنی ئەو تاکەکەسانە تاڕادەیەك کارێکی ئاسان بوو. بەڵام ئێستا کە هەمووان ئازادانە قسە دەکەن، و هەروەها دنیا چاودێری رەوتەکە بوو، کەڵك وەرگرتن لە تاکتیکەکانی تۆقاندن، ئەویش لە ئاستێکی بەربڵاو، ئیدی لە توانادا نەمابوو.

لە دەمێکدا کە ئەم ئازادییە نوێیە لە مۆسکۆ بڵاودەبۆوە،دانیشتوانی بەشێك لە کۆمارەکان هاروژابوون و وردە وردە قسەیان لە بارەی سەربەخۆیی دێنایە پێشەوە. لە مانگی مایسی ١٩٨٦ ئەم ئارەزووە گشتییەی خەڵك بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی دەسبەجێ کەوتە واری کارەوە. و ئەمەش زەمەنێك بوو کە بە پێی هەواڵێك بڵاوبۆوە، خەڵك ئاگادار ببوونەوە لە مانگی رابردوودا لە شاری چرنوبیلی ئۆکراین، رووداوێکی ترسناك لە وێستگەی بەرهەمهێنانی ئەتۆمی روویداوە و تیشکدانەوەیەکی زیانبەخش بە هەوادا بڵاوبۆتەوە، و بۆتە هۆکاری ئەوەی کە هەزاران کەس لەدانیشتوانی ئەو ناوچەیە بە ناچاری شوێنی ژیانی خۆیان بەجێبێڵن.

وا دەهاتە بەرچاو دواکەوتنی دەوڵەت لە بڵاوکردنەوەی هەواڵی ئەم رووداوە لە بارەی رەخنەکانی خەڵك لە دەوڵەتی ناوەندیی، رووبەکی قانوونی بەخۆوە دەگرت و باس و خواستی سەربەخۆیی خوازیی ئاراستە دەکرد.دانیل دیلر لەو باوەڕەدایە، "کارەساتی ئەتۆمی چرنوبیل لە نیسانی ١٩٨٦ بە خاڵی وەرچەرخانی ململانێی گلاسنووست دەژمێردرا، چونکە پیشانی رابەرانی سۆڤێتیدا، کە بۆچی بڵاوبوونەوەی ئازادی ئاگادارییەکان خاوەنی بایەخی خۆیەتی"[٦٦]. سیاسەتی ((خۆبە نەزانی پیشاندان))و بە هیچ نەزانینی کەموکوڕییەکان کە هۆکاری ئەم رووداوە بوو، هەم کرێکارانی ئەو کارگەیەو هەم دانیشتوانی ناوچەکانی دەوروبەری خستە مەترسییەکەوە کە دەرەتان هەبوو پێشگیریی لێبکرێ.

## ریفۆرمی قانوونی هەڵبژاردن

بۆ ئارام کردنەوەی نارەزایی و رەخنەگرتنەکانی خەڵك لە دەوڵەتی ناوەندی، لە ساڵی ١٩٨٨ گۆرباچۆف پێشنیاری کرد، لە رێگەی سنووردارکردنی دەسەڵاتی بەرپرسانی دەوڵەتیی و حیزبی لە کاروباری بەڕێوەبردندا، لە بنەڕەتدا دەسەڵاتی حیزبی کۆمۆنیست کەم بکاتەوە. خودی هەمان پێشنیار لە بارەی هەڵبژاردنی ئەندامانی یاسادانان خرایەڕوو، بەو شێوەیە ئەوان

دەبووایە بەدەنگی نهێنی هەڵبژێردرێن. بەڵام دەبێ ئەوە لەبەرچاوبگیرێ کە ئەم هەڵبژاردنە هاوتەرزی هەڵبژاردنی رژێمی دیموکراسی رۆژئاوایی نەبێ. بەو جۆرەی گیل شیهی روونی دەکاتەوە، بەو ئاوایە نەبوو کە هەر ئەندامێکی سەرکەوتوو لە هەڵبژاردنەکانی مانگی مایسی ١٩٨٩ بۆ کۆنگرەی نوێنەرانی خەڵك لە بەرامبەر کورسییەکەی خۆی، هەر بەو شێوەیەی لە وڵاتانی رۆژئاوادا باوە، خۆی بەقەرزاری دەنگی راستەوخۆی خەڵك بزانێ.

لە راستیدا هەڵبژاردنەکانی ئەو بەهارە لە بنەماکانی هەڵبژاردنەکانی رۆژئاواوە، لەسەر بنەمای ئەوەی کە هەر کەسە خاوەنی دەنگێکە، یەکجار دوور بوو، ئەو گۆڕانەی گۆرباچۆف دەیویست لە نێو سیستەمی هەڵبژاردندا پێکی بهێنێ ئەوەبوو هەر تاکێکی ئاسایی یەك دەنگی هەبێ. لە حاڵێکدا دەستە بژاردانی حیزبی خاوەنی دوو تا سێ دەنگ بن. بە دروستی یەك لە سێی ((نوێنەرانی گەل)) لە کۆنگرەدا کە ژمارەیان ٢٢٥٠ کەس بوو، هەرگیز بە هەڵبژاردنی خەڵك نەگەیشتنە کۆنگرە. بەڵکو رێکخراوە ((میللی))یەکانی جێ متمانە، کە زۆربەیان لە لایەن حیزبەوە کۆنترۆل دەکران، ئەوانیان دامەزراند بوو.[٦٧]

زۆربەی خەڵك، بە تایبەتی لە وڵاتانی رۆژئاوا، وایان بیردەکردەوە، چاکسازییەکانی گۆرباچۆف جۆرە چالاکییەکی ئەودیو پەردەیە بۆ لابردنی کۆمۆنیزم لە یەکێتیی سۆڤێتی. بەڵام گۆرباچۆف هەمیشە نکوڵی لەم بابەتە کردووە. لە راستیدا هەروەکو دانیل دیلر دەڵێ: "گۆرباچۆف بە وەفادارییەوە باوەڕی بە بەهاو دروستیی ئایدیۆلۆجی مارکسیستی و هەروەها پێویستی کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگا لە لایەن حیزبی کۆمۆنیستەوە هەبوو.[٦٨] بەڵام تایبەتمەندییەکانی بازاڕی ئازاد لە ئابووریدا نفووزی خۆی کردو هەروەها کۆنترۆڵکردنی بڵاوبوونەوەی ئاگادارییەکان خاوبۆوە. هەرچەندە گۆرباچۆف بەردەوام وەفاداری خۆی لە بارەی رژێمی کومۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت رادەگەیاند، بەڵام سەرەنجام بووە هۆکاری بەدبەختی.

لە دواییدا گۆرباچۆف رێگای بۆ پیادەکردنی زۆربەی پێشنیارەکانی خۆی لە بارەی پیروسترۆیکاوە بەدەستهێنا، و ئەنجوومەنێکی یاسادانانی لەسەر بنچینەی هەڵبژاردنی میللی پێکهێنا، کۆنگرەی نوێنەرانی گەل. پاشان هانی ئەم دامەزراوەیەیدا کە هەیکەلی حکوومەتی رۆژئاوایی (سەرۆکایەتی کۆمارو کابینەی وەزیران) بۆ بەڕێوەبردنی یەکێتیی سۆڤێت پەسند بکا. ئینجا نوێنەرانی هاندا تا خودی ئەو بە ناونیشانی یەکەمین سەرۆك کۆمار هەڵبژێرن، پلەیەکی بە دەسەڵات و دەسەڵاتدارێتی زۆر بەرفراوانتر لەو سەرۆك کۆمارییە {سەرۆکی دەستەی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی باڵا} تەشریفاتییە کۆنە کە تا هەمان ئەو دواییانە لە نێوان ساڵانی ١٩٨٥- ١٩٨٨ بە ئەستۆی ئەندرو گرۆمیکۆوە بوو، کە لە سەردەمی ستالین



بەجێمابوو،دامەزرا بوو. سەرەڕای ئەمە، ئابووری سۆڤێتی هێشتا بە شێوەیەکی سست و ناکاریگەر دەرۆیشت، و کەش و هەوای لیبڕالیزە بوو ئازایەتییەکی بە مەعدەنچییەکانی سیبریا بەخشی کە بۆ هەقدەستی زیاتر و ئازادی سیاسی زیاتر دەست بە مانگرتن بکە.

## جوولانەوەکانی سەربەخۆیی خوازانە



**مانگرتنی کرێکارانی مەعدەنسازیی لە مژدورچنسك. نائارامی لە روسیا سەری بۆ جوولانەوەی سەربەخۆیی خوازیی لە هەموو وڵاتەکاندا کێشایەوە**

بە سەرهەڵدانی نائارامی لە روسیا و هەموو کۆمارەکانی تر کە وردە وردە لە ژێر رکێفی دەوڵەتی ناوەندیی دەردەچوون، وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات لە زەمانی جەنگی دووەمی جیهانییەوە لە ژێر دەسەڵاتی مۆسکۆ بوون، رەفتاریان لە جاران زیاتر روو بە سەربەخۆیی چوو. ئەم جۆرە جوولانەوانە لە سپتامبەری ١٩٨٨ دەستیپێکرد و ئەمەش ئەو کاتە بوو هەزاران کەس لە خەڵکی ئەڵمانیای رۆژهەڵات لە وڵاتەکە هەڵاتن و هەروەها لە ساڵی ١٩٨٩ لە هەنگارياو پۆڵۆنیا هەڵبژاردن بەرپاکرا. برنارد گورتزمان لێکترازانی ئیمپراتۆری سۆڤێتی بەم ئاوایە پوختە دەکا:

تا کۆتایی ئەو ساڵە، هەموو ئەندامانی بلۆکی کۆمۆنیستی بە جۆرێك پەیوەستیی خۆیان بە حیزبی کۆمۆنیستی فەرمانڕەواو دڵسۆزییان بۆ مۆسکۆ خستەلاوە. رۆمانیا کە لە مۆسکۆ سەربەخۆ ببوو، بەتەواوی بە ئاراستەیەکی دیکەدا رۆیشت. کاردانەوەی گۆرباچۆف لەبەرامبەر ئەو رووداوانەدا تاڕادەیەك چاوپۆشی و بێباکی بوو.[٦٩]

لە ساڵی ١٩٩٠ جوولانەوەی سەربەخۆیی خوازی لە نێوان کۆمارەکانی غەیرە روس لە خودی یەکێتیی کۆمارەکانی سۆڤێتیدا کەوتبووە رێ. لە مانگی مارتدا لیتوانیا بە رەسمی لە

یەکێتیی سۆڤێت جیابۆوە و حکوومەتێکی ناکۆمۆنیستی دامەزراند. ئەگەر تەنیا چەند ساڵێك پێش ئەوە ئەم رووداوە هاتبایە پێشەوە، سوپای سوور بە سۆراخی ئەو کۆمارە یاخییەوە دەچوو، بەڵام کاردانەوەی گۆرباچۆف، ئابلۆقەدانان لەسەر لیتوانیا بوو، کاڵاو پێداویستیی لێ قەدەغە کرد.




**خۆبەخشانی لیتوانیایی، بۆ بەرگری لە کۆماری سەبەخۆی تازە دامەزراوی خۆیان، ئامادە دەبن**

ئەم ئابلۆقەیە کاریگەر نەبوو و هەرچەندە تا کۆتایی ساڵی ١٩٩٠ رووداوگەلێکی پەرت و بڵاوی سەربازیی روویدا، شکستی مۆسکۆ لەدامرکاندنەوەی دەسبەجێی جووڵانەوەی سەربەخۆیی خوازیی لە رێگەی بەکارهێنانی هێزی چەکدارەوە، بووە بایسی هاندانی کۆمارەکانی تر کە خوازیاری کۆتایی هاتنی قۆناغی پاوانخوازیی دەسەڵاتی حیزبی کۆمۆنیست بن. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٩١ سوپای سۆڤێتی چووە ناو لیتوانیاوە، بەڵام بەهۆکاری دواکەوتنەوە کاریگەرنەبوو. ئەم دواکەوتنە تا رادەیەك بەرەنجامی پەرت و بڵاویی فیکری رابەر و بایەخدانی ئەو بە قەیرانە زۆرەکانی چاکسازیی بوو، خەڵکی لیتوانیای پتر ئازاکرد. ئەوان سەرەڕای ئامادەبوونی هێزەکانی سوپای سوور، بەتین و تاو و گەرمییەکی لە رادەبەدەرەوە دەنگیان بۆ سەربەخۆیی خۆیاندا. لەمیانی ئەو کاتانەدا، لە کۆماری روسیا شێواوی لە حاڵی شێوەگرتندا بوو.



## پاشەکشێ دەست پێدەکا

بۆریس یەڵتسین لە ٣٠ی مایسی ١٩٩٠دا بۆ سەرۆك کۆماری روسیا هەڵبژێردرا. پاش دوو هەفتە کەمتر لەوە، پەرلەمانی کۆماری روسیا رایگەیاند، قانوونەکانی روسیا لە قانوونەکانی سۆڤێتی لە پێشترن- ژێرەوژوور بوونی تەواوی دەسەڵات سەپاویی ٧٢ ساڵەی سۆڤێت بوو بەسەر ئەو کۆمارانەدا کە یەکێتی کۆمارە سۆسیالستییەکانی سۆڤێتییان پێکهێنابوو.

گۆرباچۆف لە ژوئیەی ١٩٩١، لە هەوڵدان بۆ پێشگیری لە پاشەکشێی یەکێتیی سۆڤێت بەرنامەیەکی ئاشکرا کرد کە تێیدا دەیویست کۆمارەکانی دیکە لە دەسەڵاتدا هاوپشك بکا. لە رێگەی ئەم بەرنامەیەوە پێشنیاری دەکرد کە ئابووری بازاڕ فراوان بێ، مەزهەب ئازاد بێ و گروپگەلی نوێی مەزهەبی دیکەشدابمەزرێن، و لە هەموو ئەمانەش گرنگتر ئەوەبوو، دەسەڵاتی پاوانخوازیی حیزبی کۆمۆنیست کۆتایی بێت. ئەم پێشنیارە بووە جێگەی پشتیوانی هەموو خەڵك جگە لە بیرۆکراتە کۆمۆنیستەکان، کە بە جێبەجێ بوونی ئەم نەخشەیە پایەکانیان دەکەوتە بەر هەڕەشە. هەروەها ئەفسەرانی سوپاش لەگەڵدابەشکردنی دەسەڵاتدا نەبوون و ناڵێکییان نواند: دیڤید پرایس جونز لەم بەستێنەدا دەڵێ: "بەخشینی دەسەڵات لە ناوەندەوە بە کۆمارەکان، ژیانی سوپای سووری بەجیدی دەخستە بەر هەڕەشەوە"[٧٠]. پرسێکی دیکە رەوتی کارەکەی پتر ئاڵۆز دەکرد، ئەوەبوو ئەو کۆمارانەی کە تا رادەیەك لەنوێ سەربەخۆ ببوون، دەستیان کردبوو بەوەی کە پەیوەست بوون بە سوپای سوور بخەنە لاوەو لە جیاتی ئەوە بۆ خزمەتی سەربازیی لە کۆمارە میللییەکانی خۆیاندا ناونووسییان دەکرد.

چەند رۆژێك پاش پەسەندکردنی بەرنامەکەی گۆرباچۆف لە بەرواری ٣١ی ژوئیەدا، لە مۆسکۆ لەگەڵ جۆرج بوش، سەرۆك کۆماری ئەمریکا، دیداری کرد تا لەمەڕ ئەمبارەکانی ئەتۆمی پەیماننامەیەك لەسەر بنەمای کەم کردنەوەی هێزی ستراتیژیی ئەتۆمییەوە لە نێوان هەردوو وڵاتدا واژۆ بکەن. ئەمە هەمان "پەیماننامەی کەمکردنەوەی چەکە ستراتیژییەکان" بوو کە زامنی کەمکردنەوەی ئەو چەکە ستراتیژییانە بوو، لەبەردەستی هەردوو وڵاتی ئەمریکاو سۆڤێتدا بوو. گۆرباچۆف پاش دیدار لەگەڵ بوش بۆ بەسەربردنی مۆڵەتێکی چارەنووسساز بەرەو ((کەریمە)) کەوتە رێ کاتێك کە ئەو خەریکی بەسەربردنی پشوودانی خۆی بوو، کۆمۆنیستانی ناڵێك بە بەرنامەکانی ئەو هەوڵیاندا جڵەوی دەوڵەت بگرنە دەست.







**بوریس یەڵتسین، سەرۆك كۆماری روسیا، ئەو خۆپیشاندەرانەی كە لەبەرامبەر كەنارەگیركردنی گۆرباچۆف نارەزایەتی دەنوێنن، كۆكردۆتەوە**

## كودەتا

لە ١٨ی ئوتی ١٩٩١، كاتێك میخائیل گۆرباچۆف لە ڤێلاكەی خۆی لە(كەریمە) كاتی خۆی بەسەردەبرد، هەیئەتێك لە رابەرانی حیزب چوونە لای وداوایان لێكرد كە دەست لە پایەكەی خۆی هەڵبگرێ. ئەوان هەر لە هەمان جێ ئەویان دەستبەسەر كرد و پەیوەندی ڤێلاكەیان بە جیهانی دەرەوە بە تەواوی بڕی. پاشان لە رێگەی میدیا هەواڵ دەرەوەكانەوە بەیاننامەیەكیان بەسەر تاسەری وڵاتدا بڵاوكردەوە. لە بەیاننامەكەدا راگەیەنرا بوو، گۆرباچۆف نەخۆشەو ناتوانێ هیچ شتێك رابگەیەنێت.





**گورباچۆف و جورج بوش، سەرۆك كۆماری ئەمریكا، بۆ كەمكردنەوەی ئاستی چەكە ئەتۆمییەكان لە هەردوو وڵاتدا پەیماننامەیەك واژۆ دەكەن**

***بەرچاوترین رووداو***

*هەندێك لە چاودێران، پاشەكشێی یەكێتیی سۆڤێت بە بەرچاوترین رووداو تەماشا دەكەن. ئیچ. دی. ئێیست گرینوی لە گوتارێك لە بڵاوكراوەی بۆستۆن گلۆبدا لە بەرواری ٢٧ی دیسامبەری ١٩٩١ ئەم باوەڕە بەم جۆرەی خوارەوە راڤە دەكا:*

*ئەم رووداوە ئەوەندە مەزنە كەمێك لە خەڵك توانیویانە داچۆڕاوی ئەو رووداوە لە نێو ئەندێشەی خۆیاندا هەزم بكەن.*

*ئەم ژێرەوژوور بوونە، شتێكە لە پاشەكشێی یەكێتیی سۆڤێتی تەمەن ٧٤ ساڵە زیاترە، یان تەنانەت لە ئیمپراتۆری سەدەی بیستەمی تزارەكان، شتێكە زیاترە لە كۆتایی ئەو روسیایە كە پەتروسی گەورە لە سەدەی هەژدەیەمدا پتەوی كردو كردی بە یەكپارچە.*

*هەروەكو میخائیل گۆرباچۆف گوتی: ئەمە رووداوی هەزار ساڵ مێژوو بوو خەڵك بۆ پاشەكشێی ٧٤ ساڵەی یەكێتیی سۆڤێت خەمیان دەخوارد، و ئەوانەش كە هەرگیز خەمی بۆ ناخۆن ئەوانەن كە زەمانێك لە ژێر سێبەری حكوومەتی ئیستبدادی سامناكی ئەودا ژیاون. تاقیكردنەوەیەكی كە فلادیمیر ئیلیچ لینین لە*

*نۆڤەمبەری ساڵی ١٩١٧ لە  واری ئەندازیاری کۆمەڵایەتیدا بە رووی جیهانی بەخشی- بە تایبەتیش سەروەختێك کە زێدەڕەوییەکانی قوتابییەکانی ئەو، ستالین، ماو و پول پۆتی هاتە سەر- لەهەر جوولانەوەیەکی سیاسی دیکە لەم سەدەیەدا، کارەسات و کوشتاری هێنایە ئارا...*

*ئامانجەکانی میخائیل گۆرباچۆف کە دەیویست چاکسازیی لە وڵاتەکەیدا بەڕێوە بباو لە هەمان حاڵدا، وڵاتەکە بێ دەسکاری وەك خۆی بهێڵێتەوە، بە بادا چوو. ئایا پاشان ئەو بە ناونیشانی کەسایەتییەکی گوێزەرەوەی حکوومەت ناو دەبەن کە لە دواجاردا نەیتوانی ئەو هێزانەی ئازادی کردبوون لە دەستی خۆیدا بهێڵێتەوە یان کونترۆڵیان بکا- هەر بەو تەرزەی کە ئەلیکساندەر کیرنسکی دەسەڵاتی لە تزار وەرگرت ودایە دەستی بەڵشەفیەکەکان؟ لەوانەیە ئەو خۆشی ئێستا هەمان باوەڕی هەبێ. لە لێدوانی گۆرباچۆف لە ڕۆژی کریسمس لە کاتی دەستلەکار کێشانەوەیدا، بۆنی تێکشکان و کەسەرخواردن لە قسەکانییەوە دەهات- بەتایبەتی لە کاتی دڵسۆزی نواندن لە بەرامبەر گەلەکەیدا "کە ئیتر ئێوە هاوڵاتی زلهێزێك نین". بە دڵنیاییەوە ئەگەر لە کۆڵان و شەقامێکدا قسە لەگەڵ کەسێکدا بکرێ، لەوانەیە ئەو بڵێ کە خەڵکانی سۆڤێتی پێشوو گۆرباچۆف بە کەسێکی شکستخواردوودابنێن.*

فرانسیس ئێکس کلاینز لە گوتارێك لە نیویورك تایمزدا هەنگاوی شومی دوایی ئاوا وەسف دەکا: "گنادی یانایف، یارمەتیدەری سەرۆك کاۆمار، لە چوارچێوەی کۆمەڵەیەکدا بە ناوی کۆمیتەی دەوڵەتی هەلومەرجی ناچاری، دەسەڵاتی سەرۆك کۆماری بە دەستەوەگرت. ئەندامانی کۆمیتە بریتی بوون لە فلادیمیر کریوچکۆف، سەرۆکی کەی. جی. بی، و دیمتری بازوف، وەزیری بەرگری."[٧١]. کودەتا چەند رۆژێك پێش بڕیاری نوێی گۆرباچۆف روویدا. ئەو، مەبەستی ئەوەبوو رێك کەوتن نامەیەك ئیمزا بکا کە سەربەخۆییەکی زیاتری دەدا بە کۆمارەکانی سۆڤێت. ئەم رێکەکەوتننامەیە بێ ئامانج بووە مایەی بایەخی زۆری دووگروپ: یەکەمیان ئەوانەی کە ترسیان هەبوو گۆرباچۆف مەرامی تێکدانی یەکێتیی سۆڤێتی هەبێ؛ و دووەمیان ئەو خەڵکانەی کە لەو کۆمارانەدا چاوەڕێی سەربەخۆیی زیاتر بوون. ئەم رێك کەوتن نامەیە دەسەڵاتگەلێکی دەدا بەو کۆمارانە کە کاروباری ناوخۆیی خۆیان بەپێی ئارەزووی خۆیان بەڕێوەببن.

ڕێککەوتننامەی ناوبراو بۆ بۆریس یەڵتسین، سەرۆکی پێشووی شارەوانی موسکۆ، لە ساڵی ١٩٩٠ بە سەرۆك کۆماری روسیا هەڵبژێررابوو، ئەهمییەتێکی تایبەتی هەبوو. یەڵتسین پێوەبوو داوای دەسەڵات و دەسەڵاتدارێتی زیاتر لەیەکێتیی سۆڤێت بکا، و ئەم ڕێککەوتننامەیە کۆشش وداخوازیی ئەوی بە قانوونیی دەکرد. یەڵتسین نەخشەی ئەوەی هەبوو کە جڵەوی کودەتا بگرێ، چونکە ئەگەر نارازییانی چاکسازییەکان دەسەڵاتیان بە دەستەوە گرتبا، بە ناچاری ڕێککەوتننامەی



ناوبراو هەڵدەوەشایەوە. فەرمانێکی دەرکرد، تێیدا نوێنەرایەتییەکانی حکوومەتی سۆڤێتی دەخستە ژێر کونترولی روسیاوە.

لە ماوەی چەند رۆژێکی پاشتردا، شێواوی و ئاژاوەو لە گرێژەنەچوون بەرسنگی مۆسکۆیان گرتبوو. گەرچی بە جۆرێکی گشتی ئەفسەرانی سوپا پەرت و بڵاوبوون، وردە وردە ئەفسەرانی پایەبەرزو سەربازان لە شەقامەکاندا دژی کودەتا ریزبەندییان کرد، و پاش چوار رۆژ، کودەتا بە یەکجاری دامرکایەوە. فاکتەری کاریگەر لە تێکشکانی کودەتا خودی بۆریس یەڵتسین بوو، ئازایانە خەڵکی کۆڵان و بازاڕی دژی کودەتا جوولاندو لەو ڕێیەوە پشتیوانی لەوان کردو سەرەنجام کودەتاچییانی والێکرد، سەرکەوتن بەدەست نەهێنن. گۆرباچۆف جارێکی دیکە گەڕایەوە بۆ پایەکەی خۆی.

هەوڵدانی رابەرانی حیزبی کۆمۆنیست بۆ کودەتا، گۆرباچۆفی خستە بارێکەوە کە ئیدی نەتوانێ متمانە بەو حیزبە بکا، و لە بەرواری ٢٤ی ئوتدا، مانای شەش رۆژ پاش دەستپێشکەری بۆ کودەتا، لە سەرۆکایەتی حیزب دەستی لەکارکێشایەوە، هەڵبەتە ئەو هەروا سەرۆکی دەوڵەتی سۆڤێتی بوو- ئەو پایەیەی هێشتا دەستی لێ هەڵنەگرتبوو- بەو پێیە جارێکی دیکەش هەوڵیدا کە یەکێتی لە حاڵی پاشەکشێ رزگار بکا. بەڵام هەوڵی ئەو ناکام مایەوە، کۆمارەکانی سۆڤێت یەك بەدوای یەکدا سەربەخۆیی خۆیان راگەیاند، و لە ٢١ی دیسامبەری ١٩٩١ هەموویان، جگە لە گورجستان، بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە، تێیدا رایانگەیاند بوو کە ئیتر یەکێتیی سۆڤێت بوونی نییە.

## پاشگوتار: دوای پاشەکشێ

پاشەکشێی یەکێتیی سۆڤێت بە شێوەیەکی سەرسامهێنەر خێرابوو. کاتێك لە ٢٥ی دیسامبەری ١٩٩١ گۆرباچۆف لە پایەی سەرۆکایەتی کۆمار دەستی لەکارکێشایەوە، یەکێتیی سۆڤێت ئیتر بوونی نەما. چاودێرانی ناپیشەیی لە رۆژئاوا بە زۆری وابیروڕای خۆیان دەدەن کە بۆریس یەڵتسین جێنشینی گۆرباچۆف بوو، بەڵام بە مانای راستەقینەی وشەکە ئاوا نییە، چونکە یەڵتسین هەرگیز سەرۆك کۆماری یەکێتیی سۆڤێت نەبوو. بەڵام لە راستیدا، کۆماری روسیا، کە یەڵتسین لە ساڵی ١٩٩١ سەرۆکایەتی گرتەدەست، جێنشینی دەوڵەتی کۆچکردووی سۆڤێت بوو. بەو پێودانگە زۆر لە بیروڕا باوەکان لە بارەی رۆڵی یەڵتسین لە سەردەمی پاش سۆڤێت، بەهرەیەکی لە واقیعییەت تێدایە.

### کۆماری روسیا دەست بەسەردارایییەکانی سۆڤێتدا دەگرێ

دەوڵەتی نوێی روسیا، کە لە چوارچێوەی یەکێتیی سۆڤێتدا هاتبووەدەرێ، سوپای سوورو زۆریەی تفاقی سەربازیی سۆڤێتی بە میرات بۆ خۆی برد. روسیا، بووە میراتگریی دامەزراوەکانی سیاسەتی دەرەوەی سۆڤێتی بە پاشکۆی پەیمانە گرنگ و باڵۆیزخانەکانییەوە لە سەرتاسەری جیهاندا. زۆربەی هەرە زۆری باڵیوزانی یەکێتیی سۆڤێت بۆ باڵیوزانی دەرەوە لە روسیا گۆڕان. هەرچۆنێك بێ باڵیوزخانەکانی دەرەوە هەر هەموویان لە مۆسکۆ بوون، مۆسکۆ شارێك بوو هەم پایتەختی سۆڤێت و هەم پایتەختی روسیا بوو.

روسیا، کە بە پلە لە چوار کۆمارەکەی تری یەکێتیی سۆڤێت گەورەتر بوو و زیاتر لە نیوەی دانیشتوانی ئەوی لە خۆگرتبوو و هەروەها زۆرترین زەوی و زاری لە ژێر دەستدا بوو، هەمیشە وەکو دەوڵەتێکی سەربەدەرەوە دەژمێردرا. پایتەخت لە روسیا بوو دامەزراوە بەرینەکانی کارگێڕی و سەرکردایەتی سوپاش لەوێدا بوو. بەشی هەرە گەورەی سەرچاوە ئەکادیمی و زانستییەکان لەوێ بوون، لەوانە دەزگاکانی بەرنامەکانی بۆشایییەکانی ئاسمان و ئەمبارخانەکانی مەزنی ئەتۆمی. سەرەڕای هەموو ئەمانە، لە روسیا دەیان گروپی نەژادیی غەیرە روس لەوێدا نیشتەجێ بوون کە بە غەیری روسی قسە دەکەن، و خاوەنی کولتوور و مێژوویەکی ناڕوسین، نزیکەی لە سەدا پەنجای دانیشتوانی ٢٨٥,٧ ملیۆن کەسیی یەکێتیی



سۆڤێتی، غەیرە روس بوون. هەر بەو جۆرەی کە بۆهدان ناهایلۆ و ڤیکتۆر سۆبۆدا تەئکید دەکەن: "جیا لەوە پازدە نەتەوە لەیەکێتیی سۆڤێتدا دەژین کە کۆماری سازو ئامادەی خۆیان هەیە، دەیان گروپی نەژادیی دیکە، جا بچووك بن یان گەورە، هەن. زمان،داب و نەریتی، و مێژووی ئەو خەڵکانە لەگەڵ یەکتری زۆر لە یەکترییەوە دوورە"[٧٢]. زۆر لە کۆمارەکانی دیکە،دانیشتوانێکی زۆری لە خەڵکانی روس نەژاد تێدایە، زۆربەی ئەوانە بە زمانی ناوچەیی قسەناکەن و لەو زەمانەوە کە زمانی روسی زمانی رەسمی زاڵ بوو بە سەر سەرتاسەری یەکێتیی سۆڤێتدا، پێویستییەکیان بەم کارە نەبوو. ئەو خەڵکانە کە رەچەڵەك روس بوون لە دەمی باڵادەستی یەکێتیی سۆڤێتدا بەزۆری جێگەی نەفرەتی کەسانیتر بوون، چونکە گومان بۆ ئەوە دەچوو، خۆیان لە خەڵکی ناوچەیی بە باڵاتربزانن. ئێستاکە ئەو رەچەڵەك روسانە لە زۆربەی کۆمارەکاندا کەمینەیەکیان پێکهێناوە، لەوانەیە زۆربەیان دواجار بۆ روسیا کۆچ بکەن، گەرچی کە هەرگیز ئەوانە لەوێش نەژیابن.

### کۆمارەکانی ناو کۆماری روسیا

دەستووری نوێی روسیا واقیعییەتی جۆربەجۆری نەژادەکانی لە رێگای بەخشینی ئەندازەیەك لە ئۆتۆنۆمی بە ٢١ کۆماری نەتەوەیی و هەرێمی ئۆتۆنۆمی بە رەسمی ناسیوە، کۆمەڵە دەسەڵاتێکی بە ناوچەکان، هەرێمەکان و شارەکانی نێو فیدراسیونی روسیاداوە. هەندێك لە ناوچەکانی وەکو چیچان کۆششگەلێکیان بۆ جیابوونەوە لە روسیا بەکاربرد. بەڵام لە سەرەتای کاردا کۆششەکانی ئەوان بێبەزەییانە سەرکوتکرا. لە دیسامبەری ساڵی ١٩٩٤ سوپای روسیا چووە ناو چیچانەوەو پاش دوو مانگ جەنگی خوێناوی، گرۆزنی، پایتەختی ئەوێی داگیرکردو وێرانی کرد. لە مانگی ئوتی ١٩٩٦ دژە هێرشێك لە لایەن خەڵکی چیچانەوە روسە دەستدرێژیکەرەکانی وەدەرنا. کریستیا فریلند، رۆژنامەوانی رۆژئاوایی، چالاکی سوپای سووری لەو وڵاتەدا بەم ئاوایە وەسف کردوە: "لاوانی مەست و برسیی و بێ دیسپلینی مۆسکۆ لە چیچان هەڵدێن، جەنگاوەرانی جیاخوازیی چیچان کارێکیان ئەنجامدا لە بەدەستهێنانی فەرمانڕەوایی خۆیان زیاتر بوو. ئەوان بە روسەکان و بە تەواوی جیهانیشیان سەلماند، ئیتر کرملین ئەو دەسەڵاتەی نییە- تەنانەت بۆ پاراستنی ئەو پاشماوە ناچیزەش کە هەیەتی- کە پەنای بۆ ببات"[٧٣]. چواردە کۆماری تری یەکێتیی سۆڤێت لە زۆر لەو کێشانەدا کە بەرسنگی بە کۆماری روسیا گرتووە هاوپشکن. روسیا، ئۆکراین، قازاخستان و بیلاڕوسیا هەموویان





چەکی ئەتۆمییان بە میرات برد. جگە لە روسیا، کۆمارەکانی تر هەموویان تەکنۆلۆژیی پێویستیان بۆ پاراستن یان بەکارهێنانی چەکەکان نییە. موشەکەکان و کلاوەکان مەترسی بۆ ئەوان پێکدەهێنێ. بۆیە کەوتوونەتە بەر هەڕەشەی دزین لە لایەن کەسانی تاوانبارو فرۆشتنی بە دەوڵەتانی سەرەڕۆ یان گروپە تیرۆریستییەکانەوە.

## ئابووری نوێی ناسۆسیالیستی

هەموو ئەو کێشانەی وێڕای پاشەکشێ هاتبوونە ئاراوە، بە رزگاربوون لە سیستەمی بەرنامەڕێژی ئابووری ناوەندگرتوو پەیوەستە، کە لە مۆسکۆوە سەرچاوەی دەگرت. هەندێك لە کۆمارەکان هەندێك کارگەیان لەسەر سنوورەکانی خۆیان هەیە، لەوانەیە لە کەرەسەو پێداویستی کە لە کۆمارەکانی دیکەوەدا، بێ بەش بمێنن. هەندێك لە ناوچە کشتوکاڵییەکان کە تەنیا یەك جۆر بەروبووم بەرهەم دەهێنن لەوانەیە بە بەرهەم هێنانی لەسنووربەدەری ئەو بەرهەمە- بۆ نموونە پەمۆ- رووبەڕوو ببنەوە و ئیدی گەنم یان کاڵای دیکەی بەرهەمهێنانیان نەبێ.



**جەنگاوەرانی چیچان سواری تانکێکی روسی بوون کە بە دەسکەوت گرتوویانە، و بە نێو کەلاوەکانی گرۆزنی دا دەگەڕێن**



دەبێ سیستەمێکی تەواو نوێی بازرگانی بخرێتە روو و پیادەبکرێ، و هەر کۆمارێکی نوێ دەبێ سیستەمی دراو (پارە)ی تایبەت بە خۆی بێنێتە ئاراوە. زۆران لە بیرۆکراتەکانی یەکێتیی سۆڤێتی جاران لەو پاشەکشێیە خۆیان رزگار کردوەو لە کۆمارە تازە سەربەخۆبووەکانی خۆیاندا پلەو پایەی گرنگیان بۆ خۆیان پێکهێناوە. ژمارەیەکی زۆر لەو کۆمۆنیستانەی پێشوو مامەڵەیەکی دوژمنانەیان لەگەڵ دیموکراسیدا هەیە، ئەمەش لەوانەیە بە هۆکاری ئەوەبێ هێشتا دەستیان لە ئایدیۆلۆژیی کۆمۆنیستی خۆیان هەڵنەگرتووە. بە روانینی ئستیون باتالدن، مامۆستای مێژوو، "لە زۆر لە کۆمارەکانی ئاسیای ناوەندی و ئەودیو قەفقاز، و هەروەها هەموو کۆمارەکانی ناو ئەوروپا، بەردەوامی و یەکدەستی رابەرایەتی سیاسی لەگەڵ پاشەکشێ لە دیموکراتیزەکردندا هاوکات بووە"[٧٤]. فەرمانڕەوایانی نوێ، کەڵکیان لە دەزگای پۆلیسی ئاسایش، کە بە میرات لەیەکێتیی سۆڤێت بۆیان بەجێ مابوو، وەرگرت. تا بەو دەزگایە دەست بە سەرکوتکردن بکەن.

بۆ نموونە پاشەکەوتی زێڕی سۆڤێت، لە ئەنجامی پاشەکشێدا، بە دەستی بەرپرسانی پایەبەرز و بیرۆکراتەکان ئەوانەی کە دەستیان پێڕا دەگەیشت، تالانکرا. دیڤید پرایس جونز لە راپۆرتێکدا دەڵێ کە کریوچکۆف، سەرۆکی دەزگای کەی. جی. بی، لە ساڵی ١٩٩٠ ئاگاداری کۆنگرەی سۆڤێتی کرد کە دوازدە ملیار روبل بە شێوەی قاچاغ لە وڵات چۆتە دەرەوە. پرایس جونز روونی دەکاتەوە "ئەم ژمارەیە لە بڕی واقیعی کەمتر بووە. لە مانگەکانی نیسان و مایسی ١٩٩١، بە پێی راپۆرتە جیاجیاکان لە نێوان هەزار تا دووهەزار تۆن زێڕی سۆڤێت لە رێگەی دەریاوە گەیشتۆتە رۆژئاوا... توێژەران بەوە گەیشتوون ئەو سەرمایانەی لە سۆڤێت چوونەتە دەرەوە تا رادەیەکی نێزیك بەوە حسابەکانی هەشتا بانکی جیهانی پڕکردووە و لە بوارەکانی هوتیلداری و بازرگانی و موڵك وداراییدا خراوەتە سەرمایە گوزارییەوە."[٧٥]

ئەم تالانکارییە لە ساڵی ١٩٩١ کۆتایی نەهات. ئارنود دوبوورچ گریو، سەرنووسەری بڵاوکراوەی واشنگتۆن تایمز لە ساڵی ١٩٩٧ ئاوای نووسیوە:

مستەر یەڵتسین لە مانگی مارت، شەشەمین بەرنامەی بەربەرەکانی لەگەڵ تاوانبارانی رێکخراو بوو و پارێزەرانی خاوەن پلەو پایەی بەرزی ئەوانەی بەڕێوەبرد. ئەو، فەرمانی بە هەموو وەزیران و بەرپرسانی پلەبەرزی خۆی کرد کە لیستی هەموو سامان ودارایی خۆیان ئامادەبکەن و بیخەنە روو. بڵاوبوونەوەی حسابە کەم و هاوسەنگەکانی نێو بانکە نێوخۆییەکان زیانێکی ئەوتۆی نەدەگرتە خۆی، بەڵام حسابە کراوەکانی بانکەکانی دەرەوە بە جۆرێکی

موتلەق بە پەنهانی مانەوە. بەم دواییە بانکی ناوەندی روسیا رێگەیدا کە بڕی هەشت سەد ملیۆن دولار بۆ پێدانی حسابە ناچارییەکان بۆ دەرەوە بگوازرێتەوە.

لە ماوەی تەنیا دوو هەفتەدا، تەنیا بانکەکانی سویس لاند بڕی ٨,٥ ملیار دۆلاری لە روسیا وەرگرت و ئەمەش بە پێی راپۆرتێك کە سەرۆکی دەزگایەکی گەورەی ئابووری سویس لاندی ئاشکرای کردووە. لە ساڵی ١٩٩٢ نزیکەی ١٥٠ ملیار دۆلار لە روسیاوە بۆ دەرەوە گوازراوەتەوە... بنجامین. ئەی. گلیمان، ئەندامی حیزبی کۆماری لە نیویۆرك و سەرۆکی کۆمیسیۆنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە ئەنجوومەنی نوێنەران، {حکوومەت}ی روسیا بە کردەوە بە((دز سەروەریی عەیار تەواو)) ناودەبا"(٧٦).



**هێزەکانی دژە ئاژاوەی پۆلیسی روسیا، خولێکی پەروەردەیی بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەموو جۆرە تاوانەکان و فریاکەوتنی دەسبەجێی تاوانەکان، دەبینێ**

کۆمارە تازەدامەزراوەکان، سەرەڕای پێشگرتن بە فڕاندنی سەرمایە بۆ دەرەوە، وەزیفەیەکی تریشیان هەیەو ئەویش کاری دژواری بە تایبەتمەندی کردنی سەنعەتەکان ودارایییە کە پێشتر بە دەوڵەتەوە پەیوەست بووە. یەکێك لە کێشە سەرەکییەکانی بە تایبەتمەندی کردنی دەزگاکانی دەوڵەتیی ئەوەیە دەزگا قازانجبەخشەکان کە لە رابردوودا سوودیان بە دەوڵەت گەیاند، تایبەتمەندی کردنیان بە ئاسانی و بە خێرایی بەڕێوە دەچێ، لە حاڵێکدا دەزگا بێداهاتەکان، کە قازانجێکیان بە دەوڵەت نەدەگەیاند، وەکو کارگەکانی بەرهەمهێنانی کەرەسەکان، بە هۆی تەکنۆلۆژیی کۆنەوە ناتوانن بازاڕێك بۆ ناردنە دەرەوە پەیدا بکەن، لە ئەنجامدا وەکو بارێك بەسەرشانی خەزێنەی دەوڵەت مانەوە. هەر بەو هۆیەوە، هێشتا نەفرۆشراون. دەوڵەتی روسیا بە یاریدەدان درێژە بەوان دەدا، لە ترسی ئەوەی نەوەکوداخستنیان، دەبێتە هۆی ئەوەی



ژمارەیەك خەڵك بێکار بن، وەزعێکی خراپ بۆ خراپتر بگۆڕێ.

لە راستیدا، کرێکارانی کارگەکان تەنیا کەسانێك نین، لەبەر مەترسی لەدەستدانی کارەکەی خۆیاندا بن. بە روانینی کریستیا فریلند، دەوڵەتی روسیا مەبەستی ئەوەیە دووسەد هەزار کەس لە کارمەندانی دەوڵەت لەسەر کار لابدات. ئەم لەسەرکارلادانە گەورەیە- لەوانەش لە کار لادانی ٦٨ هەزار مامۆستاو ٢٢ هەزار کارمەندی پزیشکی بەشێکە لە بەرنامەی کەمکردنەوەی کارمەندان، بە پێی ئەوە دە تا پازدە لەسەدی کارمەندانی دەوڵەتی فیدراڵ لەسەر کار لادەبرێن"(٧٧).

دیمەنی ئەم دەرکردنە دەرەوە گەورەیە، لە نێو ئاپۆڕی خەڵکدا هۆکاری ترس و نادڵنیاییەو شتی لەمبابەتە بۆ خۆی زەوینەی گەندەڵیی زیاتر ئامادە دەکا.

## توێژێکی نوێی تاوانکار: مافیای روسی

زۆربەی دارایی دەوڵەتی پێشوو کەوتە ناو دەستی بەرپرسانی کۆمۆنیستی سۆڤێتی پێشوو. لە سەرتاسەری یەکێتی کۆمارەکانی پێشووی سۆڤێتیدا، بە تایبەتی لە بەشی سەنعەتدا، وردە وردە ناوێکی نوێ کەوتە بەرگوێ: مافیا. ئەم ناوە بە هۆی لێکچوونی دیاردەی تاوانە رێکخراوەکانی روسیا لەگەڵ تاوانکارییەکانی ئەمریکاو ئەوروپا ئەم ناوەی لێنرا. خەڵکێکی زۆر لە رۆژئاوا وایان گریمان دەکرد کە تاوانی رێکخراوکردوو، دەرکەوتەیەکی تازەداهاتووە. بەڵام ((مافیا)) بە رووتی ناوێکی نوێیە بۆ تاقیکردنەوەیەکی کۆن. گەندەڵیی سۆڤێت پێشتر زۆر لە بەرپرسانی دەوڵەتیی، سەرۆکی کارگەکان و تەنانەت وردە دوکاندارەکان و شوفێری تاکسییەکانی بۆ وردە تاوانکار گۆڕیبوو. کاتێك کە یەکێتیی سۆڤێت پاشە کشێی کرد. ئەوان بە تەواوی درێژەیان بە چالاکیی خۆیان دەدا، بەڵام بە ئازادی زیاتر و بەزۆریش بە ئەندازەیەکی بەرینتر. بەسڕینەوەی زۆر لە لایەنە سەرکوتکارییەکانی رژێمی ستالینی ئیدی قازانجی تاکەکەسیی خۆبەخۆیی بووە بنەمایەکی سەرەکی لەخولیای کەسەکاندا. یەکێتی سۆڤێت دامەزراوە گەلێکی دەستەبەرکەری تێدا نەبوو کە رێزگرتنی یاسا بێنێتە ئاراو رەفتاری دژە کۆمەڵایەتی هەموار بکا، یەکێتییە کرێکارییەکان، کاروباری خێزانی، ئەنجوومەنە مەدەنییەکان، بنکەکانی خێرخوازی، دەزگا مەزهەبیەکان، و هەواڵدەرە سەربەخۆکان یان ئەوەتا هەر هەموویان لاواز بوون یان هەر لە جێدا بوونیان نەبوو. خولیای بوونی دارایی تایبەتی تاکەکەسی و گوێزانەوەی ئەم جۆرە داراییە بۆ خێزان لە رێگەی میراتەوە، کە دەیتوانی لە جێگیرکردنی دابونەریتی هاوڵاتی بووندا سوودمەند بێت، لە ساڵی ١٩١٧وە لە یەکێتی سۆڤێت بەجۆرێکی موتڵەق جێگەی بێبایەخی بوو ، لە ئەوروپای رۆژهەڵاتیشدا هەلومەرج لەوە باشتر نەبوو.







دەزگا بێ داهاتەکان کە دەرەتانی تایبەتیکردنی ئەوان نەبوو، لە ترسی بێکاربوونی کرێکاران، دانەخران

## دیموکراسی لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات

لە حاڵێکدا کە کۆمارەکانی پێشووی سۆڤیێت لەگەڵ ناسنامەی نوێ و کێشەکانیان کە تازە وەدەرکەوتبوون، لە مامەڵەدابوون، وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتیش کە لە ژێر رکێفی یەکێتی سۆڤیێت بوون تامی ئازادی تازە وەدەستهاتووی خۆیان دەچێشت. لە نۆڤەمبەری ١٩٨٩ دیواری بەرلین رووخا، و لە ئوکتۆبەری ١٩٩١ ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و ئەڵمانیای رۆژئاوا بە رەسمی بەیەکەوە پەیوەست بوون. وڵاتانی کە پێشتر پاشکۆی سۆڤیێت بوون لە بابەتی هەنگاریا و چیکوسلۆڤاکیا حکومەتە کۆمۆنیستییەکانی خۆیان پێچایەوە و حکومەتی دیموکراسییان بنیات نا. رۆمانیا نەهەر ئەوەندە کە دیکتاتۆری کۆمۆنیستی خۆیان، نیکۆلا چاوچیسکۆ، لەسەر کار لادا، بەڵکو خۆی و ژنەکەشیان راکێشایە دادگاو لە بەرامبەر کامیراکانی تەلەفزیۆنەوە لە سێدارەیاندا. توێژینەوە لە بارەی ئەوەی کە بۆچی یەکێتیی سۆڤیێت پاشەکشێی کرد، تا ساڵانێکی دورودرێژ هەروا درێژەی دەبێ. جان. پی. مینارد گوتارنووس بەڵگە لەسەر ئەوە دەهێنێتەوە کە سۆسیالیزم خۆی خۆی وێران کرد:



بە درێژایی ساڵانی ساڵ، حکوومەتی یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤیێتی، کە هیچی بەرهەم نەدەهێنا، گەشەی کرد وگەشەی کرد و گەشەی کرد، لە حاڵێکدا کە پاشماوەی هێزەکانی بەرهەمهێن پێ بە پێ روو بە پوکانەوە دەچوو. ئەمە یەکێکی ترە لە بەڵگە سەرەکییەکانی پاشەکشێ: گەندەڵیی و پووکانەوە تا دەگاتە قۆناغی نزیك بە وێران بوونی موتڵەقی هێزی بەرهەمهێنان. ئەوەی لە یەکێتیی سۆڤیێت روویدا، بە تەزرێکی گونجاو لەو نوکتەیەدا شی بۆتەوە: "ئەوان وا خۆیان دەردەخست کە پارەمان دەدەنێ، ئێمەش وا خۆمان دەردەخست کە کاریان بۆ دەکەین." یەکێتیی سۆڤیێت لەو رووەوە شکستی هێنا کە لە دواجاردا بەرهەمهێنەرێك نەمایەوە.[٧٨]

ژمارەیەکی تر لەو باوەڕەدان، گۆرباچۆف بە هۆی پیادەکردنی سیاسەتی گلاسنووست، پاشەکشێی خێراتر کرد. مایکل ماندلباوم، گوتارنووس بە ئاماژەکردن بۆ بەرەنجامەکانی پەروەردەکردنی جەماوەری خەڵك، دەنووسێ: "خەڵکی یەکێتیی سۆڤیێتی بۆ یەکەم جار توانییان دەرباری مێژوو و ژیانی خۆیان، راستییەکان بڵێن... ئەم کارە بووە بایسی ئەوە کە شوێنەواری ئەو تۆقاندنەی حیزبی کۆمۆنیست لەماوەی سێ دەیەی یەکەمی دەسەڵاتی خۆی بەسەر خەڵکدا سەپاندبووی، پوچەڵ ببێتەوە."[٧٩] درامای زیندووی پاشەکشێی یەکێتیی سۆڤیێت ساڵانی

*پێشبینیی پاشەکشێ*

*هەرچەندە پاشەکشێی یەکێتیی سۆڤیێت تەنانەت بە ئاگاترین خەڵکی رۆژئاوای، لەوانەش دەزگای سی. ئای. ئەی، تووشی سەرسامی کرد. ئەم رووداوە پێشبینیگۆیانی خۆشی هەبوو، بەو شێوەیەی کە لە کتێبی مەرگی سەرسامهێنەری ئیمپراتۆری سۆڤێتیدا ئاماژەی پێکراوە، فلادیمیر بووکوفسکی، خەڵکی سۆڤێت و ئوپۆزیسیون، کە لە لەندەن دەژیا، لە دەیەی ١٩٨٠ بۆ دیڤید پرایس جونز، رادەگەیەنێ هەرچەندە خەڵك زیاتر نارەزایەتی لەو رژێمە دەکەن "بە لایەنی زۆرەوە تاکو ساڵی ١٩٩٠ هەموو میکانیزمەکانی سەرکوتکاریی لە کار دەکەون و دیموکراسی جێگای وی دەگرێتەوە.*

ساڵ درێژەی دەبێ. ئەوانەی لە بارەی ئاکامی کۆتایی ئەم رووداوە پێشبینیی دەڵێن ژمارەیان کەمە. بەڵام خەڵکی روسیاو کۆمارە تازە سەربەخۆکانی تر، هەر ئێستا تێدەکۆشن شێوازی دیموکراسی رۆژئاوایی، وێرا بە بازاڕی ئازاد وحکوومەتی قانوون لە وڵاتی خۆیاندا پیادە بکەن. جیهان پشووی درێژەو دەبینێ.

# پەراوێزەکان

پێشگوتار:


1. John Bergamini, The Tragic Dynasty: A History of the Romanovs. New york: G. P. Putnam`s Sons, 1969. p336.
2. Joel Carmichael, A cultural History of Russia. New york: Weybright and Talley, 1968. p. 204.
3. Daniel Deller, Russia and the Independent states. Washington, DC: congressional Quarterly 1993. p. 28.


بەشی یەکەم: شۆڕشی ١٩١٧


4. Jonathan Sandres, Russia 1917 The unpublished Revolution. New york: Abbeville press 1989, p. 29.
5. William Henry Chamberlin. The Russia Revolution 1917- 1918: From the Over throw of the Czar to the Assumption of Power by the Bolsheviks. New york: Grosset and Dunlap 1967. p. 76.
6. Richard Pipes, The Russian Revolution. New york: Knopf 1990,p. 313.
7. Pipes. The Russian Revolution, p. 309.
8. Pipes. The Russian Revolution, p. 386- 86.
9. Robert V. daniels. Russia:The Roots of Confrontation Cambridge, MA: Huard university Press 1985, p. 129.


بەشی دووەم: قۆناغی لینین ١٩٢٤- ١٩١٧


10. Lan Grey. The first fifty years: Soviet Russia 1917- 67 New york: Coward- Mccann, 1967, p. 117.
11. Daniels, Russia, p. 113.
12. Deller, Russia and the Independent states, p. 36.
13. Pipes. The Russian Revolution, p. 609.
14. Deller, Russia and the Independent states, p. 36.
15.Quoted in Ppie. Russian Revolution. P. 791.
16. Pipes. The Russian Revolution. 796.





17. Daniels, Russia, p. 114.
18. Pipes. The Russian Revolution, p674.
19. Robert Payne, The life and death of Lenin. New york: simon and Schuster. 1964. p. 536.
20. Payne, The life and death of Lenin p. 538.
21. Deller, Russia and the Independent states, p. 41.
22. Roy a. Medvedev, let history Judge: the origins and Consequences of Stalinism. New york: Knopf 1972, p. 22.
23. Louis Aragon. A history of the ussr. From Lenin to khrushchv, tran. Patrick O. Brian. New york: pavid Mekay. 1962, pp. 220. 23.


بەشی سێیەم: سەردەمی ستالین ١٩٥٣- ١٩٢٤


24. Medvedev. Let History Judge, p. 140.
25. Raymond E Zicket, ed, soviet Union: Acountry study. Washington, DC: Library of Congress. 1991. p. 67.
26. Quoted in Adam ulam, Stalin. The man and his Era. New york: Viking. 1973, p. 291.
27. Grey. The first fifty Years, p. 237.
28. nicholas V. Raisanovsky, A History of Russia, 2nd ed, New york: Oxford Nuiverity press, 1969, p. 557.
29. Medvedev. Let History Judge, p. 306.
30. Riansanovsky, A History of Russia p. 570.
31. Grey, The First Fifty years, p. 417.
32. Alexander werth, Russia: The post war years. New york: taplinger, 1971, p.p. 61- 62.
33. Quoted in daniels, Russia. P. 224.
34. Francis B. Randall, stalins, Russia: An History Reconsideration. New york Free press, 1965, p. 291.
35. Deller, Russia and the Independent states, p. 304.


بەشی چوارەم: سەردەمی خرۆشیف ١٩٦٤- ١٩٥٣


36. Roy A. Medvedev and zhores A. Medvedev, Khrushchev: Columbia university press. 1976, p. 6.






37. Robert V. daniels. Russia: The Roots of Confrontation Cambridge, MA: Huard university Press 1985.
38. Quoted in paul Dukes, Aistory of Russia: Medieual, and Contemporary. New york: Mcgraw- Hill, 1974, p. 293.
39. Grey, The First Fifty years, p. 462.
40. Nikita Khrushchev, Khrushchev Remembers: The last. Boston: Little, Brown. 1974. p 268.
41. Fedor Burlatsky, Khrushchev and the spring first Russian spring. New york: Charles scribner`s sons, 1988, p. 93.
42. Deller, Russia and the Independent states, p. 78.
43. Deller, Russia and the Independent states, p. 78.

بەشی پێنجەم: سەردەمی برژنیف ١٩٨٢- ١٩٦٤

44. Burlatsky, Khrushchv and the first Russian Spring, p. 215.
45. Zhores A.Medvedev, Andropov. New york: W. W. Norton. 1983. p. 104.
56. Burlatsky, Khrushchv and the first Russian Spring, p. 224.
47.Quoted in Deller, Russia and the Independent states, p. 85.
48. Riansanovsky, A History of Russia p. 619.
49. Daniels, Russia, p. 350.
50. Daniels, Russia, p. 327.
51. Quoted in zicket, Soviet union p. 418.
52. Qouted in Burlatsky, Khrushchv and the first Russian Spring, p. 223.
53. Medvedev, Adropov, p. 140.
54. Quoted in Hedrick smith. The Russian. New york: Quadrangle, 1976, p. 84.
55. Deller, Russia and the Independent states, p. 97.
56. Medvedev, Adropov, p. 111.
57. Medvedev, Adropov, p. 115.
58. Burlatsky, Khrushchv and the first Russian Spring, p. 225.

بەشی شەشەم: سەردەمی گۆرباچۆف ١٩٩١- ١٩٨٥

59. Zhores A.Medvedev, Andropov. New york: Norton. 1986, p. viii.



60. Deller, Russia and the Independent states, p. 110.
61. Zickel, Soviet Union, p. 492.
62. Medvedev, Gorbachev, pp 190- 91.
63. Zickel, Soviet Union, p. xxii.
64. Deller, Russia and the Independent states, p. 110.
65. Dusko Doder and Louise Branson, Gorbachev: Heretic in the Krimlin. New york: Viking, 1990, p. 244.
66. Deller, Russia and the Independent states, p. 110.
67. Gail sheehly, The man who changed The world: The lives of Mikhail s. Gorbachev. New york: Harper Collins, 1990, p. 275.
68. Deller, Russia and the Independent states, p. 108.
69. Bernard Gwertsman and Michawl T. Kaufman. Eds. The Decline and fall of the soviet Empire. New york. Times Books. 1991, pp. xviii.
70. David pryce- Jones. The strange Death of Soviet Empire. New york: Henry Holt. 1995, p. 405.
71. Quoted in Gwertzman and Kaufman. The Decline and fall of the soviet Empire. P. 384.

پاشگوتار: دوای پاشەکشێ

72. Bohdan nahaylo and victor Swoboda, Soviet Disunion: A History of the Nationalities problem in the ussr. New york: Free Press. 1989. p. xi.
73. Chrystia freeland. Russia: From Empire to Nation state," Financial Times. July 15. 1997.
74. Stephen and Sandra Batalden. The newly Independent States of Eurasia. Hand book of Fromer Soviet Republics. Phoenix oryx 1993, p. xir.
75. Pryce- Jones. The Strange Death of the Soviet Empire, p. 385.
76. John p. Maynard, "Soviet Communism Collapsed on its own" in William Barbour and carol wekesser, eds, The Breakup of the soviet union san Diego: Greenhaven prees, 1994, p. 22.
79. Michael Mandlelbaum, Collapse of the Soviet Union," in Breakup of the soviet Union, p. 46.





## زاراوەکان

سۆسیالیزەکردن: زەوتکردنی زۆرەملێی زەوی و زاری جووتیاران و گۆڕینی بە کێڵگەی هەرەوەزیی دەوڵەتیی.

بەلشەفیك: باڵێکی حیزبی سۆسیال دیموکراتی کرێکاری روسیا کە پاشان بە سەرکردایەتی لینین بوو بە حیزبێکی خاوەن دەسەڵات. ئەم باڵە لە شۆڕشی روسیادا سەرکەوتنی بەدەستهێناو ناوی حیزبی کۆمۆنیستی لە خۆی نا.

برۆسترویکا: دووبارە بنیاتنانەوە، پلانی گۆرباچۆف بۆ چاکسازیی حکوومەت و چالاکییە ئابوورییەکان.

پۆلیت بوورو: مەکتەبی سیاسی کۆمیتەی نانوەندی حیزبی کۆمۆنیست، دەزگای دارێژەری سیاسی یەکێتیی سۆڤێتی. لە سەردەمی خرۆشیفدا بە پریزیدیوم ناودەبرا.

تیرۆری سوور: هەڵسوورانی تەواو ئازادانەی پۆلیسی سەر بە دەزگای چکا لە ساڵی ١٩١٨- ١٩٢٠ لەو ماوەیەدا خەڵك بێ بەڵگەو بێدادگایی کردن، دەگیران و لە سێدارەدەدران. لینین بە مەبەستی پێشگرتن بە نارەزایەتی، پیادەی دەکرد.

پاکتاوکردن: سەردەمی نێوان دەیەی ١٩٢٠- ١٩٣٠ کە تێیدا جەماوەری بەرینی خەڵك بە پشتیوانی پروپاگەندەی تەمومژاوی یان بێ بناغەوە، دەگیران، دەخرانە بەندیخانە یان لە سێدارەدەدران.

ساڵنامەی یولیانی: ئەو ساڵنامەیەی کە تاکو ساڵی ١٩١٨ لە روسیا بەکاردەبرا، پاش ئەوە حکوومەتی نوێی بەلشەفیکی ساڵنامەی گریگوری کە لە زۆربەی وڵاتانی رۆژئاوادا رەسمیی بوو، لە جێگای ئەودا خستەکار.

چکا: یەکەمین دەزگای پۆلیسی نهێنی سۆڤێتی لە ساڵی ١٩١٧ تا ١٩٢٢ چالاکی هەبوو.

سکرتێری گشتی: سەرۆکی حیزبی کۆمۆنیست و سەرپەرشتیاری پۆلیت بوورو، رابەری یەکێتیی سۆڤێتی بوو.

پرەنسیپەکانی برژنیف: ئەم سیاسەتە پاش سنووربەزاندنی سۆڤێت بۆ ناو خاکی چیکوسلۆڤاکیا لە ساڵی ١٩٦٨ گیرایەبەر. بنەمای ئەو سیاسەتە پێشگرتن بە گۆڕانی هەر حکوومەتێکی کۆمۆنیستی بوو بۆ شێوە حکوومەتێکی تر کە دوژمنی یەکێتیی سۆڤێتی بێ.

دوما: ئەنجوومەنێکی راوێژکاری تزار بوو، پاشان بوو بە ئەنجوومەنی یاسادانان.

رووناکبیران: چینی خاوەن بیر کە دەستبژاردەکانی کولتووری، سیاسی و زانکۆیی دەگرتەوە.

زەوی و زارە بەیارەکان: بەرنامەی بە ئاکام نەگەیشتووی کشتوکاڵی خرۆشیف بوو، کە نزیك بە ٣٥ تا ٥٠ ملیۆن هیکتار زەوی دانەچێنراو کرا بە کشتوکاڵ.

سەرمایەداری: سەرمایەداری بە مانای سیستەمی ئابووری ئازاد، ئەم زاراوەیە لە بنەڕەتدا زاراوەیەکی مارکسیستییە، و مەبەست لەو زاراوەیەش سیستەمێکی ئابوورییە کە تێیدا "خاوەنەکانی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان"، یان هەمان ئەو سەرمایەدارانە، بەهرە لە دەست رەنجی کرێکاران دەخۆن.

سپییەکان: نارازاییانی بەلشەفیکەکان لە ماوەی جەنگی ناوخۆییدا، کە لە ئەفسەرانی پێشووی تزاری و نێوەندرۆیانی کە نارازییانی حکوومەتی بەلشەفیکەکان بوون.



سۆسیالیزم: رژێمی سیاسی و ئابووری کە تێیدادامەزراوە ئابوورییەکان بە دەوڵەت پەیوەستە یان لە لایەن دەوڵەتەوە کۆنترۆڵ دەکرێن، هەروەها کۆمۆنیزم.

سیاسەتی نوێی ئابووری (نپ) گەرانەوەیەکی پاژەکی بۆ سیاسەتی بازاڕی ئازاد بۆ جووتیاران ودامەزراوە بچووکەکان کە لە ساڵی ١٩٢١ بەرێوەبرا.کاتێك کە {نەخشەی} ستالین لە ١٩٢٩ پیادەکرا، ئەم سیاسەتە لابرا.

شورا (سۆڤێت) ئەنجوومەنی راوێژکاری، ئورگانی بنەڕەتی حکوومەتی یەکێتیی سۆڤێت بوو لە هەموو بووارەکاندا.

پرۆژەی مارشاڵ: نەخشەیەك بوو بۆ پێشکەشکردنی هاوکاری دەوڵەتی ئەمریکا بۆ وڵاتانی ئەورووپای رۆژئاوا بۆ نۆژەنکردنەوەو چاك کردن و پڕکردنەوەی زیانەکانی جەنگی دووەمی جیهانی؛یەکێتیی سۆڤێت بەشداری تێدا نەکرد.

قوزاقەکان:سوارەی سوپایی خەڵکی ئۆکراین و باشووری روسیا کە لە سەدەی هەژدەیەمدا چوونە نێو سوپێی روسیا.

کەی. جی. بی : پۆلیسی نهێنی؛ کۆمیتەی ئاسایشی حکومی.

کومونیزم: رژێمی ئابووری سۆسیالیستی کە لەوێدا ئامرازەکانی بەرهەمهێنان، مانای هەموودامەزراوە و دەزگاکانی بازرگانی، مولکدارێتی گشتی دەبن و بە دەستی دەوڵەت کۆنترۆڵ دەکرێن، کۆمۆنیزم ناوێکی تری مارکسیزم.

کۆمۆنیزمی جەنگیی: سیاسەتی لینین بۆ گۆڕینی خێرایی رژێمی ئابووری بۆ کۆمۆنیزم لە رێگەی سەرکوتکردنی بێبەزەییانەی بەربەرەکانییەکان لە ساڵی ١٩١٨ تا ١٩٢٠.

کۆنگرەی حیزب: زیاتر ئەنجوومەنێکی تەشریفاتی بوو کە هەر پێنج ساڵ جارێك بەڕێوە دەچوو، نوێنەرانی هەموو کۆمارەکانی سۆڤێت کۆدەبوونەوە تا رەزامەندی خۆیان لەسەر هەموو چالاکییەکانی دەوڵەت بخەنە روو.

کولاك: جووتیارانی دەوڵەمەند، یان هەر جوتیارێکی کە کرێکار بەکرێ دەگرێ؛ و پاش سۆسیالیزەکردنی زۆرە ملێ لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٢٠ بە هەر جوتیارێك دەگوترا کە لەگەڵ سۆسیالیزەکردندا نالێك بووایە.

گلاسنووست: کەش و هەوای کراوەی سیاسی؛ رەخسانی بووار بۆ ئەوەی خەڵك لە بارەی سیاسەتەکانی دەوڵەتەوە توێژینەوەو ئاخاوتنیان هەبێ، کە بەشێك بوو لە بەرنامەی چاکسازیی گۆرباچۆف.

گوسپلان: ناوێکی کورتکراوەی روسییە بۆ کومیسیۆنی پلاندانانی دەوڵەتیی کە لە ساڵی ١٩٢١دامەزراو بەرپرسی بەرنامەکانی پێنج ساڵە بوو.

مارکسیزم: ئایدیولوژییەکی سیاسییە کە کارل مارکس (١٨٨٣- ١٨١٨) هێنایە کایەوە.

مەنشەفیك: باڵێکی حیزبی سۆسیال دیموکراتی کرێکاری روسیا کە باوەڕی وابوو سۆسیالیزم دەبێ وردە وردە بگاتە قۆناغی پێگەیشتوویی. ئەم باڵە بەردەوام لەگەڵ باڵی بەلشەفیکدا لە کێشمەکێشدابوو.





## سەرچاوەی زیاتر بۆ خوێندنەوە


Deborah Adelman. The "Children of peresyroika" come of Age: young people of Moscow Talk about Life in the New Russia. Armonk, NY: M. E. sharp. 1994

ئادلمان لەگەڵ لاوانی خوار تەمەنی بیست ساڵەدا دیدار دەکاو روانینی ئەوان لە بارەی رووداوەکانی دە ساڵەی دوایی مێژووی یەکێتیی سۆڤێتی وەردەگرێ.

Moshe Brauer, Atlas of Russia and the Independent Republics. New york: Modern Library. 1995.

بە پاشەکشێی سۆڤێت دەبووایە نەخشەکان و ئەتڵەسەکانی یەکێتیی سۆڤێتی بە شێوەی واقیعی رۆژ دەربکرێن. لەم کتێبەدا نەخشەکان و نیشانە نوێیەکان لەگەڵ ئاماژە ئامارییەکاندانیشتوان ناسی و جوگرافیایی دەکەونە بەرچاو.

Paul Dukes, A History of Russia: Medieval, Modern, and contemporary. New york: MC graw- hill. 1974.

کورتە مێژوویەکی گشتگیر، پوخت کراوەو ئاسان بۆ خوێندنەوە.

Stephen Handelman, Comrade Criminal: Russia`s New Mafiya. New Haven, ct: yale Univeristy press. 1995.

هاندلمان لە سەرەتاکانی دەیەی ١٩٩٠ پەیامنێری تورنتوستار بوو لە مۆسکۆ. لەم کتێبەدا هەم لەگەڵ تاوانکاران و هەم لەگەڵ کەسانی ئاساییدا چاوپێکەوتنی سازداوە.

Anatol Lieven, The Baltic Revolution: Estonia, Latvia, Lithuania and the path to Independence. New Haven, CT: Yale Univeristy press, 1994.

لە کاتی پاشەکشێدا، نووسەری ئەم کتێبە لە حەوزی بەڵتیکدا رۆژنامەنووس بوو، لەم کتێبەیدا مێژووی ئەو ناوچەیە لە دێرین زەمانەوە تا دەگاتە ئەمڕۆ، دەنووسێتەوە.

Ellen Mickicz, changing channels Television and the struggle for power in Russia. New york: Oxford University press, 1997.

کاریگەری چالاکییەکانی تەلەفزیۆن لە کاتی دواین رۆژەکانی یەکێتیی سۆڤێتی. بۆریس یەڵتسین رایگەیاندوە کە "تەلەفزیۆن روسیای رزگار کرد."





R.R. Milner- Gulland et al, Cultural Atlas of Russia and the Former soviet Union. New york: Checkmark books, 1998.

ئەم ئەتڵەسە، کولتوورەکانی ناوچە جۆربەجۆرەکانی سۆڤێت بە نەخشەو وێنەو دەقەوە پیشان دەدا.

Richard pioes, Acconcise History of the Russian Revolution. New york: Knopf, 1995.

مێژووی کلاسیکی دوو بەرگی شۆڕشی روسیا.

Herri Troyat, Daily Life in Russia Under the last Tsar. Trans. Malcolm Barnes. Palo Alto: Stanford University press, 1979.

لەم کتێبەدا شێوەی ژیانی خەڵك، بە تێکرا لە بارەی دێهات نشینەکان و چینی ئەشرافەکان، لە روسیای تزاریدا پێش شۆڕش شیکراوەتەوە.




